# ساحەی یاری ئەمریکا و ئێران

یارییەکان چین؟ شوێنی یارییەکان کوێیە؟ کێ ئاماجی
یارییەکانە؟ چۆن خۆمان بپارێزین لە یارییەکان؟



نوسینی : سەردار کەریم

" بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ "

## پێشەکی :

الصلاة و السلام على خاتم الانبياء و المرسلين و من تبعهم باحسان الى يوم الدين ..

ئەم کتێبە : گەشتێکە بە ناو مێژووی ئیسلامی دا . مەبەستی سەرەکی گەڕانی تۆی خوێنەرە بۆ شارەزا بوون لە مێژووەکەت . بۆ ئەوەی بزانیت مێژووی تۆ خوێناوی نیە ؟.. توراسی تۆ کێ و چۆن پارێزگاری لێ کراوە ؟.. کێ و کەی شێواندوویەتی ؟..

ئەم شێواندنە بووەتە هۆکاری ئەوەی (دەجال) و , مەهدی و مەسیح (عليهما السلام) دەرچن ...

سەردار کەریم

22.6.2019

هەر کەس شارەزا بێت لە دنیا , دەزانێت کە ئەمریکا و ئێران شەڕ ناکەن . بەڵکو باشترین دوو دەوڵەتن بۆ ئەوەی یاری بە ئێمەی موسوڵمانی عەوامی داماوی نەزان بکەن . چەندین ساڵە شیعە و ئەمریکا شیعەگەری بڵاو ئەکەنەوە لە هەموو جیهاندا , بۆ لێدانی موسوڵمانی ڕاست و دروست و لاواز کردنی ئاینی ئیسلام .

لە بەرامبەریشدا هیچ هیزێکی ئیسلامی نییە ڕووبەڕووی ئەم دوو دژە ئیسلامە ئێران و ئەمریکا ببێتەوە .

بەتەنها دەوڵەتانی خەلیج هەیە، خەڵکی موسوڵمان و نا موسوڵمانیش ئەمانە بە ئیسلامی راست دادەنێن چونکە خاوەنی مەککە و مەدینە و حەج و سەرەتای ئیسلامن .

لە بەرامبەردا ئەمانەی کەنداوی عەرەبی بە زانای ئاینی و عەوام و سەرۆکی دەوڵەتەوە . هیچیان لە ئەمریکا و ئیران کەمتر نییە بۆ لێدانی ئیسلامی مەزن . بگرە ئەمریکا و ئێران بە ڕەحمترن لە لێدانی ئیسلامدا .

ئەمانە دژایەتی ئاینی ئیسلام دەکەن بە ناوی ئاینێکەوە خۆیان دروستیان کردووە , پێیدەڵێن (سەلەفی) خەتەریاتی ئەم سەلەفییە بۆ لێدانی ئیسلام لە ئەمریکا و شیعە کاریگەرترە . چونکە ئەمانە بە پارەی نەوت یارمەتی ئیسلامی جیهادی دەدەن لە دەرەوەی کەنداو .

بە دەسەڵاتی سەربازی ناوخۆیان کۆنترۆڵ کردووە . مامۆستا و پێشنوێژ و عولەمایان هەیە لە ناوخۆ و لە دەرەوەی کەنداو ئاینی خودات پێدەفرۆشن لە ڕێگای ئەو ئاینەی کە دروستیان کردووە و ناوی سەلەفییە .

ئەم مشەخۆرانەی ناویان سەلەفییە دەزانن ئاینی خودا دەفرۆشن و فەتوا دروست دەکەن بە ناوی ئاینەوە .

لە بەرامبەردا کابرایەکی سۆفی یان موسوڵمانێکی ئاسای ئەگەر هەڵە بکات لە نەزانی و نەخوێندەواریی خۆی دەیکا.

بەلام سەلەفی بە عیلمەوە دەیکات چونکە ملی دەق و حەدیسەکان دەشکێنێت .

ئاینی سەلەفیزمی (لورانس العرب) لەدوای جەنگی جیهانیی یەکەم کە دروست کراوە ئەم ئایەتە تطبیق دەکەن :
( وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ) .
ئاینی ئیسلامیش موڵکی هیچ کەس نییە و موڵکی خودایە . خوداش خۆی دەزانێت چۆن پارێزگاری لێدەکات .
ئەم ملهوڕە خاوەن نەوتانە بە خەڵکی ئاسای و عەوام لانابرێن . خاوەنی دەسەڵات و پارەن .
لەوەش گرینگتر خاوەنی ئاینن و خۆیان کردووە بە فریاد ڕەسی موسوڵمان لە هەموو جیهاندا . لە هەموو وڵاتان شوێنکەوتوویان هەیە بەناوی سەلەفییەوە .
دەبێت کۆتاییەك هەبێت بۆ لێدانی ئەم سەلەفییانە ساحەی یارییەکانی ئەم چوار ساڵەی داهاتوو جۆرا و جۆرە .
بە پلەی یەکەم شەڕی ئێران و ئەمریکا بۆ لاوازکردنی پێگەی سەلەفیزمە چونکە نایەنەوێت لایبەرن .
بەڵکو ڕیسوایان دەکەن و لاوازیان دەکەن ، کە دواتر چۆنیەتیەکەی باس دەکەم .
دەبێت سەرەتا ئەوە بزانین بۆچی ترامپیان داناوە بۆ سەرۆکی ئەمریکا ؟ چونکە ماوەی هەشت ساڵی سەرۆکایەتی جمهوورییەکان هەڵگیرساندنی شەڕە . هەشت ساڵی دوای ئەوان تۆپەکە دەچێتە قاچی دیموکراتییەکان .
ئەوان شەڕەکان هێور دەکەنەوە و بناغە دادەنین بۆ شەڕی هەشت ساڵی داهاتوو و ئامادەی دەکەن بۆ جمهورییەکان باشترین کەسیش بۆ جمهوورییەکان خەڵکی بێ مەنهەجە وەك بۆشی باوك و کوڕ . ئێستا نۆرەی ترامپە ، ترامپ خۆی کەسێکی مقاولە لە هەموو جۆرە کارێکدا و ئیش نییە نەیکردبێت . هەموو فێڵ و فەرەجێك ئەزانێت و ئەزانێت چۆن یاری بە خەڵکی دەکات .
الحمدلله من لە 18\3\2016 دا باسم کردووە کە ترامپ دەبێت بە سەرۆکی ئەمریکا , واتە 8 مانگ پێش هەڵبژاردنی ئەمریکا دەست پێبکات لە 8\11\2016 .

فەرمون ئەمەش لینکی پۆستەکەمە هی 2016 ..

https://www.facebook.com/groups/1683635728590809/permalink/1694570054164043/

وە ئەمەش دەقی پۆستەکە :
(( کێ ئەم پیاوە دەناسێت ؟.. دۆناڵد ترامپ ..
من پێشبینی دەکەم ببێت بە سەرۆکی ئەمریکا و بۆ 8 ساڵ شەڕ و ئاژاوە و خوێن ڕشتن دروست بکات لە جیهاندا .
وە ڕێکخراوێکی بەریطانیی مەزنیش پێش بینی ئەوە دەکات . ئەم دەم و چاو کاریکاتێرە هەڵ بژێررێت دەبێت بە یەکێك لە 10 مەترسیدار ترین شتەکان کە ڕووبەڕووی هەموو جیهان دەبێتەوە . )) .. 18\3\2016

ڕاپۆرتەکە : (فوز ترامب بالرئاسة بين "أكبر 10 مخاطر" تهدد العالم)

لەم لینکەدایە بە عەربیە :

http://www.bbc.com/arabic/worldnews/2016/03/160317_trump_presidency_risks?fbclid=IwAR3uRUbQYdE_PFXo2_PZY3MSDPmg4a4bXBxeb5Ft81YtPF9aYX8eg7CDyjo

مرۆڤ لە جیهاندا بە گشتی بە شێوەیەك دەژین ، ئاگاداری پێش خۆیان و مێژوو نین . هەمیشە لەو کاتەدا دەژین کە تێیدان و گوێ نادەنە داهاتوو و بیری لێ ناکەنەوە . بۆیە هەمیشە دەسەڵاتداران بە درێژایی مێژوو توانیویانە کە یاری بە خەڵکی بکەن .
ئەو یاریەش پێیدەڵێن سیاسەت . واتا قۆزینەوەی گەمژەیی گەلان و یاریکردن بە ئاستی زانین و زانیاریان .

ئەوەی سەیر و سەمەرەیە ترامپ لە 8\11\2016 دا هەڵبژێردرا .
هەفتەیەك دوای ئەوە , واتا لە 17\11\2016 دا . هەر خۆیان هەواڵیان بلاّو کردەوە . ترامپ پێش ئەوەی ماوەی سەرۆکایەتیی تەواو بکات لا دەبردرێت لە سەرۆکایەتی ئەمریکا .
لەوانەیە شتێکی سەیر بێت هەفتەیەکە سەرۆك هەڵبژێردراوە, دەڵێن لادەبردرێت لە سەرۆکایەتی !!

وەك دەبینن خەریکە ماوەی یەکەمی سەرۆکایەتی تەواو دەکات و ساڵێکی ماوە بۆ مانگی 11ی 2020 و لانەبردرا .
کەواتە لە ماوەی دووەمی سەرۆکایەتیی لا دەبردرێت . لە هەڵبژاردنی داهاتوودا جارێکیتر هەڵدەبژێررێتەوە بە سەرۆکی امریکا لە 2020 بۆ 2024 و لەو ماوەیەدا لادەبردرێت .
لێرەدا ئەگەرێکی زۆر گەورە و لۆژیکی هەیە . کە لەوانەیە پێش چەند مانگێك لە هەڵبژاردنی 2020 تاوانی زۆر گەورەی پێبکەن لە ڕۆژهەلاّتدا . ئەو تاوانانە بقۆزنەوە بۆ ئەوەی لە هەڵبژاردنی 2020 دا دەری نەچوێتن .

کە من ئەگەری یەکەم بە بەهێزتر دادەنێم , وە لە فەترەی سەرۆکایەتیی دووەمدا لایدەدەن .

بۆ زانیاریتان هەڵبژاردنی ئەمریکاش وەك لای خۆمانە , و خۆیان دیارییان کردووە کێ دەردەچێت لە هەڵبژاردندا .

لە ساڵی 2016 دا کاتێك باسی لابردنی ترامپ کراوە ..

الحمدلله من هەمان ڕۆژ پۆستم کردووە و سیناریۆی (مۆنیکا لیونسکیم) داناوەتەوە و بۆ مێژوو تۆمارم کردووە .

کە سیناریۆیەکی مندالاّنە دروست دەکەن بۆ لابردنی ترامپ .

بەلاّم بەگوێرەی ڕووداوەکان بێت کە خۆمان تێیدا دەژین پاش دوو ساڵ لەو پۆستە .
سیناریۆی لابردنی ترامپ مندالاّنە نابێت و خوێنێکی زۆر دەڕێژرێت و وێرانکاریەکی زۆری پێدەکەن ، ئەو کات لای دەبەن .

ئەمەش لینکی پۆستەکەی 2016 یە :

https://www.facebook.com/sardar.karem.714/posts/700267070147437

وە ئەمەش دەقی پۆستەکە :

(( کێ بیل کلینتۆن و مونیکا لوینسکی بیر ماوە ؟!

قەزیەیەکی هیچ بوو سەرۆکی ئەمریکایان لابرد و جۆرج بۆشی کوڕیان هێنایە جێگای کە کەسێکی مەشروب خۆری معتاد بوو , کە بەهۆی کڵێساوە وازی لە مەشروب هێناو یەکێك بوو لە مەسیحیە توندڕەوە چەپەکان و ڕووداوی 11ی سێپتێمبەریان دروست کرد, و بە بۆشی سەرخۆشی توندڕەو جەنگیان لە جیهاندا هەڵگیرساند ..

ئێستاش ترامپی قومارچی و ساختەچی دەستبڕیان کردووە بە سەرۆك , وە (آلان لیتشمن) کە بە پرۆفیسۆری پێشبینییەکان ناسراوە لەسەر سەرۆکەکانی ئەمریکا لە ساڵی 1984 وە و خۆی مامۆستای مێژووی سیاسییە لە زانکۆی (واشنطن) دەڵێت: ترامپ پێش ئەوەی ماوەی سەرۆکایەتی تەواو بکات لا دەبردرێت لە سەرۆکایەتی .

دەبێت چی چاوەڕوان بکەین لە ترامپ و چۆن دنیای پێ تێك بدەن و دوایش لای بەرن ؟

دەبێت چی جۆرە ئیسلامێکمان بۆ دروست بکەن و بڵێین: 1000 ڕەحمەت لە (کفن دز = داعش) . وە دەبێت دژەئیسلامی گێلیش چۆن شیکاری بۆ ئەم ئیسلامە تازەیە و ڕووداوەکان بکات ؟ وە دەبێت موسوڵمانی گێلی جیهادیش چۆن ببن بە سووتەمەنی بۆ ئەم ئیسلامە تازەیە ؟ وە دەبێت پێشمەرگەی داماویش چۆن بکەن بە سووتەمەنی بۆ ترامپ ؟

ئەم باسە بۆ مێژوو دادەنێم وە کاتی خۆی قسەی لەسەر دەکەین ان شاء الله.. )) ... 2016\11\17

ڕاپۆرتەکە :

("بروفيسور التنبؤات" يتوقع: دونالد ترامب سيعزل قبل نهاية ولايته) :

**واشنطن، الولايات المتحدة الأمريكية -- (CNN) قال آلان ليتشمن، أستاذ التاريخ السياسي في جامعة واشنطن، والمعروف بلقب "بروفسير التنبؤات" لتمكنه من التنبؤ بدقة بهوية المرشح الفائز في الانتخابات الرئاسية الأمريكية منذ عام 1984 وصولا إلى انتخاب دونالد ترامب، إن الأخير لن يتمكن من إكمال ولايته وسيخرج من السلطة بعملية سحب ثقة منه ...**

لەم لینکە دایە بە عەرەبییە :

https://arabic.cnn.com/world/2016/11/17/allan-lichtman-professor-predicts-trump-impeachment-erin-burnett?fbclid=IwAR15hjBqZoy13apNWciIpYs7uTr63cJ5XrIS3YltWph-d7Osv9US5s2UtNY

..................................................................................................................................

پاش ئەوەی هەفتەیەك دوای دانانی ترامپ بلاویان کردەوە ترامپ لادەبردریت . دەبێت ئامادەکاری بکرێت بۆ ئەو لابردنە . ساڵێك دوای ئەو هەواڵە واتا . لە ڕۆژی 16\5\2017 دا ، جارێکیتر ئەمریکا (قاعیدە)ی دروست کردەوە لە ڕێگای کوڕەکەی بن لادنەوە .

هەواڵەکە :

(حمزة بن لادن.. ابن أسامة الذي يحاول إعادة تنظيم القاعدة إلى سابق قوته...) :

**واشنطن، الولايات المتحدة الأمريكية —(CNN) أظهرت رسالة دعاية جديدة من تنظيم القاعدة أن هذا الأخير يحاول تجديد خطابه باستخدام جيل من عائلة أسامة بن لادن، إذ دعا ابنه، حمزة، إلى مهاجمة اليهود والأمريكيين والغربيين وحتى الروسيين باستخدام أسلوب الذئاب المنفردة...**

لەم لینکەدایە بە عەربیە :

https://arabic.cnn.com/world/2017/05/16/al-qaeda-bin-laden-son?fbclid=IwAR14NDjAAMAYtG2oymjJ84XGkA8OtCoAtzVsNb_C_rM9NnWHgVV1GiEiRBg

.....................................................................................................................

ئێستا 2019یە, واتا 3 ساڵە خەریکی هەستاندنەوە و بناغەدانانی قاعیدەن . جارێکیتر مێژوو دووبارە دەبێتەوە . قاعیدە دروست دەکەنەوە لە ڕێگای ئاینی (لورانس العەرەبی سەلەفیزمی سعوودیەوە) . مەوعیدی دروست کردنیشی دیاری کراوە و 30\5\2019 یە .. واتا چوار بۆ پێنج ڕۆژ پێش جەژنی ڕەمەزانی 2019 قاعیدە دروست دەکرێتەوە و لە دوای جەژنەوە هەتا 2020 بە تەواوەتی لای هەموو جیهان دەناسرێت .

دەقی هەواڵەکە :

**دعا ملك السعودية سلمان بن عبد العزيز آل سعود قادة دول مجلس التعاون الخليجي والدول العربية إلى عقد قمتين طارئتين لبحث تداعيات الهجمات التي استهدفت السعودية ودولة الإمارات العربية المتحدة.**

**وذكرت وزارة الخارجية السعودية على تويتر أن القمتين ستعقدان يوم 30 مايو / ايار الجاري في مكة.**

**وتأتي الدعوة في ظل تصاعد التوتر في منطقة الخليج بين الولايات المتحدة وإيران.**

**ونشرت الولايات المتحدة سفنا حربية وطائرات في الخليج في الأيام الأخيرة بسبب ما وصفته بـ "التهديدات" الإيرانية.**

**ونقلت وكالة الأنباء السعودية الرسمية عن مصدر بوزارة الخارجية قوله إن الدعوة جاءت من "باب الحرص على التشاور والتنسيق مع الدول الشقيقة في مجلس التعاون لدول الخليج العربية وجامعة الدول العربية، في كل ما من شأنه تعزيز الأمن والاستقرار في المنطقة." ............**

لینکی درێژەی هەوالەکە :

http://www.bbc.com/arabic/middleeast-48324750?fbclid=IwAR3muhAsNRapvcnJoPWhCf_9yRv5dPiFV9kAQjFQl4x8nGPeA1fL3wOkTx8

**سوودەکانی (القاعدە) و (حمزة بن لادن) ئەوەیە :**

**خەڵکانێکی زۆر لە سعوودیە و لە جیهان شوێن کوڕی بن لادن دەکەون و زۆر بە ئاسانی دەتوانن قاعدە لە ماوەیەکی کورتدا بژیێننەوە .**

**قاعیدە ناسراوە لە جیهاندا لە دەرەوەی جیهانی ئیسلامیش بەهۆی 11ی سێپتێمبەرەوە . لە میدیا هەر شتێك باس بکرێت دەربارەیان . خەڵکی یەکسەر باوەڕ دەکەن چونکە پێشتر ناسراو بووە لەلایان .**

**قاعیدە بەهانەیەکی چاکە بۆ لابردنی ترامپ ، پاش ئەوەی کوشتاری زۆری پێدەکەن .**

**تا ئێستا لەم باسەی من دا پاڵەوانی یارییەکان دیاریکراون :**

**یەکەمیان :** **قاعیدەیە .**

**وە داعش دەورێکی لاوەکیی بچوکی دەبێت .**

**زۆر گروپ و ناوی تازەتری جیهادی دروست دەکرێت ، بەڵام پشکی شێر بۆ قاعیدە و حمزة بن لادنە.**

**دووەمیان** **: شیعەیە .**

**شەڕەکە** **: شەڕی مەزهەبییە لە نێوان: (** **شیعە و سوننە** **)**

**ساحەی شەڕەکان** **: هەموو دەوڵەتە بەناو ئیسلامییەکانی ئێستایە لە مەغریب هەتا ئەندەنووسیا .**

**ساحەی سەرەکیی شەڕەکە : بە پلەی یەکەم (عێراق)ە, بە تایبەت ناوەڕاستی عێراق .**

**پێویست ناکات ئەمریکا و ئێران شەڕ بکەن یان هێز بنێرن .**

**تەقینەوە لە ڕێگای ئەو گروپە جیهادییانەوە دروست دەکرێت ، یا TNT بەستن لە گەمژەیەك یان سەیارەیەکی بۆمبڕێژکراو , مخابرات لە ڕێگای تایبەتی خۆیەوە بە ناوی قاعیدەوە یان حیزبێکی تری جیهادییەوە دەیتەقێنێتەوە . ئەم کارانە زۆر ئاسانە و دەتوانرێت لە هەموو جیهاندا بکرێت و پێویستی بە سوپای ئەمریکی نییە . وە پێویستی بە سوپای پاسدارانیش نییە .**

**ڕۆژی 30\5\2019 بەفەرمی دەوڵەتە بەناو ئیسلامیەکان . فەرمان وەردەگرن بۆ ئەوەی ئاسانکاری بکەن بۆ دروست بوونی قاعیدە و موخابەرات و پۆلیسیان کەس نەگرێت و مەجالیان بدەنێ خۆیان دروست بکەن .**

**ئەم کارانەش بۆ دەوڵەتێکی وەك ئەمریکا و ئێران ئاسانن . ئەزموونیان هەیە لە دروست کردنی گروپە جیهادییەکان.**

**لە سەردەمی نوێی ئێستاشماندا قاعیدە یەکەم هێز و حەرەکەی جیهادی بووە . ناسراوە لای موسوڵمان و ناموسوڵمان. دامەزرێنەری قاعیدە بە دەستی ئەمریکا کوژراوە . کوڕەکەی تۆڵە دەستێنێتەوە . کەوڵە کۆنەکە دەهێننەوە تازەی دەکەنەوە . خەڵکیی بۆ کۆ دەکەنەوە و سنوورەکانیان بۆ دەکەنەوە و پارەیان بۆ سەرف دەکەن . بە شەڕی مەزهەبی گەرم دەبن و پارەی سعودی و ئیماراتی هەیە سەما بە وەتەری جیهادیان بکات .**

لە ساڵی 2019 کۆتا بنکەی داعش بە فەرمی نەما لە (باغۆز) , لە ساڵی 2017 پۆستم کردووە کە چیتر داعش و ئەم حەرەکە ئیسلامییانە دەوریان نامێنێت . وەلی ئەمری سەلەفیزمی وەهابی کار لەسەر ڕووخانی دەوڵەتەکان دەکات .

ئەمەش دەقی پۆستەکەمە :

(( ئیرهاب و کەباب و شەباب :

کەس مونیکا لوینسکیی بیرماوە ؟ بۆچی کلینتۆنیان لابرد ؟ بۆچی بۆش کوڕی سەرخۆشی گاوری چەپی توندڕەویان هێنایە جێگای کلینتۆن ؟
بۆ ئەوەی ڕووداوی 11ی سێپتێمبەر دروست بکەن بە یارمەتی مخابەراتی ئەمریکی و بن لادن · وە کەسانی شارەزا دەزانن سیناریۆی 11ی سێپتێمبەر بە یارمەتیی مخابەرات کراوە و بن لادن و قاعیدە یارمەتیدەر بوون · مەبەستی سەرەکیش تێکدانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو وەك لەبەرچاوتانە و دەیبینن .

پاشان داعشیان بۆ دروست کردین و کێڵگەی خوێن و سەربڕینان بۆ چاندین · نیوەی سوریا و عێراقیان بۆ چۆڵ کردن و داعش هات بۆ موسڵ بەڵام سوپای عراقی هەتا نیوەی بەغدای بۆ چۆڵ کردن·

ئەك ناڵبەند کوێر بێت گەنجی موسوڵمانی گەمژە ئەبو قۆندەرە ی بەغدادی بە خەلیفە دا بنێیت · داعش نەما و شەڕی نوێ زۆر ترسناکە ·
لە ڕێگای مەلیکە مل هوڕەکانی سعودیە , وەلی ئەمرە مانگا شیردەرەکانی امریکاوە · ئەم جارەیان دەیانەوێت موسوڵمان بە دەوڵەتەوە لەناو بەرن و کار لەوە دەرچووە کۆمەڵێکی ئیرهابیی وەك قاعیدە و داعش دروست بکەن · ئەم هەشت ساڵەی ترامپ لێدان و ڕووخانی دەوڵەتە بە دەستی وەلی ئەمرەکان · ئەوەتا یەمەنیان ڕوخاند ئێستا سەرەی قەتەرە و وەلی ئەمریش خەمی بەرزترین بینا و گەورەترین جێگای گەشتیاریی هەیە لە جیهاندا .
وە گرنگ نیە لە لای دەوڵەتەکانی موسوڵمانی چواردەوری لەناو بچن · مادام پارە هەیە بۆ تێرکردنی ناوگەڵ و ورگی , وەك مەیموون سەما دەکەن بۆ هەموو کەس ..

ئەوەی قازانج دەکات ئەمریکایە بە ناوی ئیرهابەوە کەباب دەخۆن, شەبابی موسولمانی داماویش شەق دەخۆن ·بەڵام یارییەکان گۆڕراون و ئێستا دەوڵەتەکان شەق دەخۆن با بزانین دای قەتەر سەرەی کوێیە؟ بەسپۆنسەری ئالسعود .))

لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/sardar.karem.714/posts/809332555907554

......................................................................................................

چۆن 30\5\2019 قاعیدە دروست دەکرێتەوە ؟

لە مانگی دوازدەی 2018 و سەرەتای ساڵی 2019 دا . میدیاکان هەواڵیان بڵاو دەکردەوە هەتا مانگی شەشی ٢٠١٩ دەبێت زۆر لە ڕژێمە عەرەبییەکان بگۆڕدرێن . ئەوەتا کۆتایی مانگی پێنجە ، و خۆشتان دەبینن چی ڕوو دەدات لە سودان و جەزائیر و لیبیا .

مەبەستی من لێرەدا چییە ؟
ڕووخاندنی ڕژێمی سیاسی لە سودان و جەزائیر و لیبیا لەم پێنج مانگەی پێشوودا . خاڵی دەست پێك و سەرەکی ئال سعوودە بۆ هەموو دەوڵەتە بەناو ئیسلامییەکان لە کۆبوونەوەکەی 30ی مانگ .

واتا 30\5\2019 , (وەلی ئەمری سەلەفیزمی وەهابیی لورانس العرب) . کۆمکاری عەرەبی سازدەکات, فەرمان بە هەموو سەرۆکە عەرەبییەکان دەکات حەرەکەی جیهادی زۆر لەناو وڵاتەکانیان دروست بکرێت . کار ئاسانیان بۆ بکرێت بۆ سنوور برین و تەقینەوە .
هەر وڵاتێکیش بە قسەیان نەکات, (لیبیا و سودان و جەزائیر)ی بۆ دەکەن بە نموونە و ئەڵێن : ئەوەتا ئێستا لەو سێ وڵاتە نە حوکمەتی تێدایە و نە تێیدا نییە . چۆنمان بوێت و کێمان بوێت سەری دەخەین .
ئەو ولاتانەی تریش کە ئاژاوەی تێدا نییە دەتوانین بە شەش مانگ ئاژاوەی تێخەین وەك ئەو سێ ولاتەی لێبکەین.

بە قسەم بکەن دەسەڵاتتان دەمێنێتەوە . بە قسەم نەکەن دەتان ڕووخێنم . سەنەدی ئەم فەرمانانەش هی خۆم نییە و هی ئەمریکایە . ئێمەش لە (عبدالعزیز بن سعود)ی باپیرمان وەرمان گرتووە . عبدالعزیزیش لە (لورانس العرب)ەوە وەری گرتووە ..

گرینگی ئەم لادانانەی کۆتایی ئەم سێ وڵاتە لەوەدایە ، هێز و دەسەڵاتیان داوەتە دەست سوپا ، دەرسیان وەرگرتووە لە بەهاری عەرەبییەوە گۆڕانکاری نابێت لای خەڵکەوە بێت بەڵکو لای سوپاوە بێت .
بەگوێرەی خوێندنەوەم بێت بۆ ڕووداوەکان, ئەم جارە قاعیدە لە لیبیا دروست دەکرێتەوە بە فەرمانی (وەلی ئەمری لورانس العرب) لە جەزائیر موجاهیدینی بۆ دەچێت چونکە داخ لە دڵن لە (بو تفلیقە) .
لە سودان زیندوو دەکرێتەوە ، چونکە بن لادن لە سودانەوە قاعیدەی بنیاتنا و گەورەیکرد . ئەو بەناو موجاهیدانەی دێن بۆ عێراق و بۆ سعوودیە بۆ شەڕی شیعە و مەزهەبی پشکی شێریان لەو سێ ولاتەوە دەبێت .

زیندووکردنەوەی قاعیدە و ئەم حەرەکانە لە دوای جەژنەوە کاریان دروستکردنی ئاژاوەیە . بۆ ئەوەی بەهانە بدەن بە دەست ئەمریکاوە فڕۆکە بنێرێت ئەو ناوچانە وێران بکات .

ئەسڵی شەڕی ئەمریکا و ئێران ئەمەیە ، بەهانە بدەن بە ئەمریکا فڕۆکە بنێرێت یان بە ساروخ لە موسوڵمانان بدات . شەڕەکان دوورن لە زەوی ئێران و ئێرانیەکانەوە . لە بەرامبەریشدا ئێران ساروخ دەنێت بە ناوچەکانی تری دەوروبەری ئەو ناوچانەی ئەمریکا ساروخی تێگرتووە .

بەکوردی و بەکورتی لایەکیان جێگایەك وێران دەکا, لاکەی تریش وەك تۆڵە کردنەوە لە لاکەی تریان . چوار دەورەکەی وێران دەکات .

هەردوو لا شەڕی ساروخ دەکەن . ئەمریکا دوورە لە زەوی خۆیەوە . ئێرانیش دوور لە زەویی خۆی شەڕ ناکات .

شەڕەکان یاریی پەت پەتێنە . پێویستە هەمو تاکێك خۆی فێری پەت پەتێن بکات و بزانێت کام پەتە بادەدرێت و یاریی پێدەکەن .. هەتا باز هەڵبدات و پەتەکە لە قاچی نەئاڵێت و بکەوێتە یاریی شەڕە ساروخەوە .

پێشتر باسم کرد , شەڕی چوار ساڵی داهاتوی ترامپ بە لێدانی دەوڵەت بە دەوڵەت و حیزب بە حیزب دەبێت . واتا سوپای ئەمریکی شەڕ ناکات .

**قۆڵی یەکەمی شەڕەکان** : عێراقە و هەموو ناوچەکان دەگرێتەوە لەزاخۆ هەتا بەصرە . شەڕەکانیش :

مەزهەبیین: شیعە و سونە , قەومین: کورد و عەرەب , حیزبیین: حیزب لە حیزب دەدات وە هەموو جۆرێکی تر ...
**قۆڵی دووەمی شەڕەکان** : سعوودیە و ئیماراتە . ئەو دووانە لە ڕێگای حوسیەکانەوە شەڕی تێدا دەکرێت .
واتا ئێران دوورە لە ساحەی شەڕەکانەوە .

لەوانەشە کورد خۆی کەر بکات و شەڕەکان بهێننە ناو کوردستانەوە هی باشوور و ڕۆژهەلات ..
ئێستا دەبینن کە یەکێتی و پارتی دە مانگ زیاترە نەیان توانیووە ڕێك بکەون بۆ حکومەتی هەرێم .

کەواتا دابەشکردنی کورد بۆ زۆنی سەوز و زەرد مسۆگەرە, و مەسەلەی وەقتە و هێشتا کاتی نەهاتووە .
هەرێمێکی تریش دەکرێتەوە لە شنگال بۆ یەزیدیەکان واتا کوردوستان دەبێت بە سێ بەشەوە .

ئەمەش دەقی پۆستەکەمە :

(( من مردوو ئێوە زیندوو ..

لە داهاتوو دا کوردستان دەکرێت بە 3 بەشەوە : زۆنی سەوز و زۆنی زەرد و زۆنی یەزیدییەکان .

واتا 3 هەرێم و ئینجا ئەو کاتە مەعاشەکەمان جوانتر دەبێت .

من باسی ئێستا ناکەم بەڵکو باسی داهاتوو دەکەم و ئەم قسەیە فڕێ دەدەم بۆ مێژوو .. )) ( 2016\6\24 )

لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/sardar.karem.714/posts/626669697507175

.........................................................................................................

ئەم چوار ساڵەی داهاتوو کاتی پارچەپارچەکردنی عێراق و شوێتی تریشه .
بەکورتی و بەکوردی ئەم پێنج ساڵەی داهاتوو ئامادە باشییە بۆ کارەساتێکی زۆر گەورە ،
وەزعەکان بەرەو خراپی دەچێت . خۆشتان دەبینن لە میدیاکان مەلای جۆرا و جۆری نەزان و جاهیل دەهێنن و یاری بە ئاین دەکەن . بەرنامەی سەیر و بێ تامی غەیرە ئاینی بلاو دەکرێتەوە ، ئامانجیان تێکدانی کۆمەڵگایە لە هەموو لایەنێکی ئاینی و کۆمەلایەتی و.. هتد ...

هەموو پیلانەکانیشیان سەردەگرێت و سەرکەوتوو دەبن تیایدا ، چونکە میللەت نەخوێندەوارە . خاڵی لەوە گرینگتر کەس ناتوانێت هەڵەکان ڕاست بکاتەوە یان وەڵامیان بداتەوە ، چونکە یاریەکان و شەڕەکان و چەواشەکاریەکانی میدیاکان لە هەزار لاوە دێت .
ئیعلام و پارەی زەخمی زلهێزەکانی بۆ سەرف دەکرێت ، بۆیە وەڵامی من لە ئەکاونتێك لە فەیسبووك یان تۆ لە پەیجێك یان مەلایەك و بانگخوازێك لە پەیج یان ئەکاونتی خۆی ناچێتە ڕیزی تڕی بن گۆمیش .

ئایا ئێوەی تاکی کورد هەر هەمووتان خۆتان بە تاوانبار و گەمژە نازانن بوونەتە هۆکاری ئەوەی ناوەڕاستی عێراق تەسلیمی حکومەتی بەغداد بکەن بە بەلاش و ئەوەتا دەبینن ئەو ناوچە کوردییانەی سنورەکان تەعریب دەکرێن و خەرمانیان دەسووتێنن .  ئایا تۆی تاك هەست بەوە ناکەیت تاوانباری سەرەکییت ؟ ئایا تۆ نەبویت بە فیکەی ڕیفراندۆم هەڵدەپەڕییت ؟ , ئایا تۆ نەبویتە هۆکاری قەرەباڵغی سەر جادە و بەردەم میدیاکان بۆ ڕیفراندۆم ؟ ئایا تۆی تاکی ڕیفراندۆمچی نەبوویتە هۆکاری ئەوەی حەشدی شەعبی بگێڕدریتەوە بۆ ناوچە دابڕاوەکان ؟

ئێوەی کورد بۆ ئەوە باشن لەژێر ڕەحمەتی پۆستاڵی هەموو سوپایەکدا بژین . گەلێکی گەمژەن بە سەربەخۆی دەتوانن هەمو یاریەکتان پێبکەن . ئەم پێنج ساڵەی داهاتووش دەبینین چۆن بە ناوی کوردایەتیەوە دەتانکەن بە سووتەمەنی یاری ئەمریکا و ئێران . کوردی نەزان بۆچی ئەقڵت بە (بایومەتریك) نەشکا کە دەسەلاتە ئیداریەکان جیا دەکرێتەوە ؟ , پاش بایومەتریك بۆچی ئەقڵت بە ڕیفراندۆم نەشکا کە بەهانەیە بۆ ئەوەی ناوچە دابڕاوەکان تەسلیم بە بەغداد بکرێتەوە و بۆچی بەشداریت کرد ؟

ئەمەش دەقی پۆستەکەمە : ((بایۆمەتریك پێشەکی ڕیفراندۆم بوو ؟ ئەگەر شتێکمان بوێت پێشەکی دەدەین وە دڵنیاین کە ئەو شتە هی ئێمەیە ٠ ریفراندۆم واتا بەشکردنی کوردوستان و مردنی ماددەی 140 ئەگەر ئەمەش ڕوووبدات. کێشەیەکی ئیداریی گەورە دروست دەبێت لە پێدانی موچە ٠ باشترین چارەسەریش سیستمی بایۆمەتریکە هەرکات کوردستان بەشکرا . هەر بەشە و مووچەخۆری سنووری خۆی دەزانێت کێیە و چەندیان بداتێ . وە هیچ کێشە و پشێوی دروست نابێت... ) .            2017\6\22
لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/sardar.karem.714/videos/818184811688995/?fref=mentions

ئەوەی دەیبینین و دەیزانین جەنگێك بەرێوەیە لە نێوان دوو زلهێزدا ..
ئەم دووانە شەڕ ناکەن لە ساحەی خۆیاندا . ئەم پرسیارە زۆر گرنگە :
( بۆچی ئەم شەڕە لەم کاتەدا و بۆچی لە ساحەی خۆیان شەڕ ناکەن و کێ سوودمەند دەبێت و کێ زیانی بەر دەکەوێت ؟ )
وەلآمی ئەم پرسیارە : لە پرسیارێکی تردایە خودی پرسیارەکەی تر وەلآمە بۆ هەموو ڕووداوەکان .

پرسیارەکە هی برادەرێکە لە واڵەکەم کردوویەتی ، دەڵێت :

( باشە مامۆستا پرسیارێك !..
ئایا ئەمریکا ئەم هە موو سیاسەت و یاری و شەڕ و مەسروفی سەربازیەی بۆ چییە تا لە ئیسلام و مسوڵمان بدات وەك ئەی بینین ئیسلام زەعیف و مسوڵمان پەرش و بلاّوە , تەنها بە ئیعلام و فاحیشە بلاّوکردنەوە کافی نیە ؟. )

من خۆم ئەو پرسیارەم لا دروست ببوو . وە کارم لەسەر دەکرد ، پاش ئەوەی لە بابەتەکان و ڕووداوەکان تێگەیشتم وەك لایەنی ئاینی و سیاسی و چۆنێتیی بەرێوەچوونی ڕووداوەکان . بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ فەیسبووك و بۆتان بکەم بە زنجیرەیەك ، وەك دەبینن ئێستا خەریکین بە نووسینی : ( ساحەی یاری ئەمریکا ئێران ) .

هەمووان دەبینین موسوڵمان لاوازە و ئەسڵەن دەتوانیت بڵێیت: بوونیشی نییە . چونکە ئێمە بووین بە هەزاران پارچەوە و دینەکەمان بووە بە دینێکی تورەهات ، کەس نازانێت کێ ڕاستە و کێ لەسەر حەقە .
باشترین نموونەش ئەگەر کەسێکی یابانی یان سویدی یان ئینگلیز ببێت بە موسوڵمان و شارەزا بێت , لەم هەزاران بەشە لای کاممان شەهادەت دەهێنێت ؟
ئەگەر کەسێکی ئاقڵ بێت دەڵێت ئەو ئیسلامەم ناوێت و کەی توانییان خۆیان ڕێك بخەن و ببن بە یەك مەنهەج , ئەوکات منیش دەبم بە موسوڵمان .

ئاینی ئیسلام وەك بون بونی نەماوە ، هۆکاری سەرەکیش تەنها یەك شتە.
هەتا ساڵی 1918 دەوڵەتێك هەبووە پارێزگاریی لەم ئیسلامە کردووە . سەرەتا ئەمەوییەکان پاشان عەباسیەکان پاشان عوسمانییەکان . بە نەمانی عوسمانییەکان ئەم ئیسلامە تورەهاتەی ئێستا دروست بوو و گەیشتینە ئەم حاڵەی کە ئێستا تێیداین .
هۆکاری سەرەکی ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانییەکان (عەرەبی حیجاز) بوون بە سەرکردایەتیی (لورانس العرب) دەوڵەتی عوسمانییان ڕوخاند لە سعودیە و کەنداو و عێراق و ئوردن و فەلەستین و شام .

سەری فیتنەکە و پریشکی ئاگرەکە لە مەککەوە سەری هەڵدا و بەرهەمەکەی ئەم (ئال سعود)ە بوو .

ئال سعوودیش بۆ ئەوەی بتوانن بەردەوام بن سەرەتا هاتن (محمد بن عبدالوهاب)یان کرد بە سەرکردەی ئاینی و بەهۆی لێدانی سۆفییەکانەوە بناغەی حوکمیان داکوتی بۆ نەوەکانی دواتری خۆیان و هەتا ئێستاش لە حوکمدان .

خەڵکی گێل بێ ئاگان لەوەی کە (سۆفیزم) زۆر کۆنە و لە سەرەتای ئیسلامەوە هەیە ، هیچ خیلافەتێکی ئیسلامی نەهاتووە لێیان بدات و بنەبڕیان بکات . سەلەفی ئەشکەوتی شانازی بەوەوە دەکەن وەهابییەکان سۆفیەکانیان نەهێشتووە و دژی شیرك بوون .

هەی ئەشکەوتیی نەزان ئەو پیلانە هی (لورانس العرب)ە و وەهابیەکان سۆفییان لەناو برد , بەڵام ئاینی ئینگلیزیان بڵاوکردەوە و ئەوەتا دەبینن ئینگلیز و ئەمریکا حاکمن نەك ئاینی وەهابی .

ئەوەتا دەبینن هەشت ساڵ جارێك وەهابییەکان دەبێت وەك مەیموون سەما بکەن بۆ سەرۆکی نوێی ئەمریکا و بایی ملیارەها دۆلار بەتەنها هەدیە بدرێت بە سەرۆك بێجگە لە دۆشینی تر .

ئەم پێشەکیە پێویست بوو لەبەر دوو خاڵی سەرەکی :

**یەکەم :** لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە هەتا ئێستا هەموو دنیا سعوودیە و زانایانی بە دەمڕاست و فریادڕەس و ترۆپك و گەورەی موسوڵمانان دەزانن .

**دووەم :** سەدا نەوەدی موسوڵمانان بە پێچەوانەی خاڵی یەکەم سەیری سعودیە و زانایانی دەکەن و دەزانن سعودیە و زانایانی کۆمەڵێك کەڵەکچین و نوێنەری ئیسلام نین .

ئەم دوو خاڵە زۆر گرینگن ، نا موسوڵمان و سەدا چلی موسوڵمانیش وا دەزانن سعودیە سەرکردەی موسوڵمانە و دەبێت ئاین لەوان وەر بگرین .
هەرکەسێکیش لە ئاینی ئیسلام شارەزا بێت دەزانێت سعوودیە و زانایانی سعودیة دوورن لەئاینی ئیسلامی پیرۆز .
ئەم دەسەڵاتەش ڕەگ و ڕیشەی داکوتیووە و هێزێکی زۆری پارە و سەربازیی هەیە و لابردنی لە لایەن ئێمەی موسوڵمانەوە زۆر زەحمەتە .

دەسەڵاتی ئەمریکاش لای نابات و ئیشی پێیەتی ، بەڵام ئەمریکا بە هەموو شێوەیەك دەیەوێت لاوازی بکات وەك لایەنی ئاینی . چونکە زۆرینەی خەڵك وا دەزانن سعودیە پارێزەری ئیسلامە .
ئەمریکا لە سعودیە دەدات بەڵام ناهێڵێت بکەوێت , ڕێگاکان زۆرن دووانیان زۆر کاریگەرن بۆ لاوازکردنی ئاینی ئیسلام .

**ڕێگای یەکەمیان بۆ لێدانی :**

دینی سەلەفیزم لە سەرەتای دروست کردنیەوە ئینگلیز قورمیشی کردووە بە شێوازێکی دارێژراو لەسەر ئەو مەنهەجەیە سەدا هەشتای دینەکەیان لەسەر ئافرەتە .

برۆن بۆ پێگەکانیان یان مەجلیسەکان و دەرسەکانیان ، هەر هەموی ئەم پرسیارانەیە :

ئایا جائیزە ئافرەت ئەمە بکات و ئەمە نەکات ؟

ئایا جائیزە ئافرەت ئەمە لەبەر بکات و ئەمە لەبەر نەکات ؟

ئایا جائیزە ئافرەت بچێت بۆ فلان شوێن و نەچێت بۆ فلان ؟

هەزاران هەزار قەید و شەرتیان داناوە بۆ ئافرەت , هەرهەمووی تەئویلات و قسەی هیچی دینی سەلەفیزمە نەك حەدیسی صحیح یان ئایاتی قورئان .

بەم شێوەیە وایان لە موسوڵمان و ناموسوڵمان کردووە ئافرەت زۆر سوکتر لە کۆیلەش سەیر بکات . دیقەت بدەن لە هەر جێگایەك بیانەوێت ئاژاوە دروست بکەن ، بابەتی ئافرەت و مافی ئافرەت دەوروژێنن لە دیدی ئیسلامەوە .

ئەو ناوچەیە دەبێت بە دەندوکی کەو سوور دەبێتەوە و چۆنیان بوێت کێشە دروست دەکەن .

بەحوکمی ئەوەی شارەزای فکری ئیسلامی و فکری ئەوانەشم کە دژایەتی ئیسلام دەکەن . دەڵێم ٩٩٪ ی ئەو باسانەی دەربارەی ئافرەتە لە ئیسلامدا . هەرهەمووی دروستکراوی سەلەفیزمی خێڵەکی سعودییە . ئەوانەش کە پشتگیری دەکەن لە ناوە و لە دەرەوەی سعوودیە . هەرهەموویان کەسانی دڵ پیسن .

قورئان و سونەت و ئاینی ئیسلام بێبەریە لەم ئاینە خێڵەکییە , من وەك موسوڵمانێك حەزم نەکردووە ئەو بابەتانە بوروژێنم بەڵام دەیڵێم . هەرهەموو بابەتەکانیان تەئویلاتی زانایانی سەلەفیزمی سعودییە ,نەك هی سەلەفی ساڵحی پێش ئال سعود .. بەڕەحمەت بن .

دوو نموونە باسدەکەم :

یەکەمیان : حەرامی شۆفێری ئافرەت .. تەئویلاتی سعودیەیە و بەشێك نییە لەدین .

دووەمیان : نیقابی ئافرەتە ، نە لەقورئاندا هاتووە و نە لەسونەدا هەیە و نە هیچ دەقێك هەیە لە لایەن هەر چوار ئیمامەکەوە دەربارەی نیقاب .

**ڕێگای دووەمیان بۆ لێدانی :**

دروستکردنی گروپی جیهادییە بە وەحشیترین شێوە خەڵکی سەردەبڕن و وێرانکاری دەکەن و ئەو ناوچانەی لەژێر دەستیاندایە حوکمێکی گەندەڵ و فاشیلی تێدا دەکەن . هەزار ڕەحمەت بۆ داعش دەنێرین , وە ئاوات دەخوازین بە حوکمی داعش و دەڵێین ئەوان بە ڕەحمتر بوون لە سووکایەتی بە ئیسلام .

پێویست ناکات.. بە دوای سەرچاوەدا بگەڕێیت بزانیت (لورانس العرب) کێیە و چۆن ئەم (ئال سعود)ەی دروست کرد و چۆن دەوڵەتی عوسمانی پێ ڕووخاندن .

پێویست ناکات.. بزانیت (محمد بن عبدالوهاب) کێیە و چۆن ئینگلیز ئاینێکی کاثۆلیکیی پێدروست کرد .

پێویست ناکات.. بزانیت ئەم ڕەش و ڕووتە پێ پەتیانە چۆن پارەیان دەست کەوت و لە چی دا سەرفیان کردووە و سالآنە چەند سەرانە دەدەن بە ئەمریکا .

پێویست ناکات.. بزانیت چۆن حەرەکەی سەلەفیزم دروستکراوە لە ناو سعودیە و لە دەرەوەی سعودیە ..
چۆن ئاینێکی کاثۆلیکی کلێسا ئاسا و پاپاکانیان دروست کرد لە ناوجەرگەی وەحی و پیرۆزییەکانی ئیسلامدا !
مەبەستم لە (پاپاکان) دەمڕاستی سەلەفیەکانە .
بۆ نموونە پاپای کوردەکان (عبداللطیف)ە و هەرشتێك پاپا نەیڵێت ناکرێت .

لە بەرامبەریشدا ....
پێویست ناکات.. بزانیت ئاینی شیعە چییە و چۆن دامەزرا و چۆن تا ئێستا بەردەوام بووە .

پێویست ناکات.. بزانیت (عبداللەی بن سبآ) کێ بووە و مەجووس چی بوون و کێ بوون .

پێویست ناکات.. بزانیت شیعە لە مێژوو دا چییان کردووە و چۆن هەتا ئێستا بەردەوام بون .

هەتا ساڵی 2025 هەموو هەواڵێکتان پێدەگات لە لایەن میدیای سعوودی و ئێرانی و کلکەکانیانەوە .

هەردوو لایان یەکتری کەشف دەکەن و ئەوەی بن بەڕە دێننە سەر بەڕە .
شەڕەسەگ و سەگەشەڕی شیعیزم و سەلەفیزم لە میدیاکانەوە بەردەوام دەبێت و هەمووان شارەزا دەبین لە هەردووك ئاین .

ئاقڵ ئەو کەسەیە لەم یارییەی نێوان ئێران و ئەمریکا و سعودیة استفزاز نەبێت و هەستی ئاینی نەجوڵێنن و تووشی جیهاد و شەڕی بکەن . هەر کەس بکوژرێت , دەڕوات نە شەهیدە و نە بۆ خودایە .
ئاقڵ ئەو کەسەیە گەنمەشامی دەخوات بە دیار فیلمی ئەم سەگەشەڕەوە ، سەیری شەڕەسەگەکان دەکات و پێیان پێدەکەنێت .

سوودی ئەم کەشف کردنە چییە ؟

سعوودیەی ملهوڕی سەلەفیی وەهابی بۆ ماوەی چل ساڵە ناوێرێت و ناتوانێت هیچ شتێك بڵێت لەسەر ئێرانی ڕافیزە، ئەم ملهوڕانەی سعودیة و شوێن کەوتووانی خاوەنی سەدان میدیا و کەناڵی جۆرا و جۆرن . جورئەتی ئەوەیان نەبووە یەك کەناڵیان هەبێت ئاینی شیعە کەشف بکات .

لە کاتێکدا ئێران بە سەدان کەناڵی ئاسمانی و میدیای هەیە کە کفر دەکەن .

کاتی ئەوە هاتووە ئەم دوو دوور لە خودایە سەلەفیزم و شیعە , بەربنە یەك و خۆیان خۆیان کەشف بکەن .

کاتی ئەوە هاتووە هەردوو لایان بە بەڵگەی خودی خۆیان , باس بکەن چۆن یاری بە قورئان و سونەت دەکەن و چۆن ملی ئایات و حەدیس دەشکێنن بە ناوی سەلەفەوە . (سەلەفی صالح) ڕەزا و ڕەحمەتی خودایان لێبێت بێبەریە لەمانە و لەم ئاینە تازەیەی (لورانس العرب) .

ئەگەر بە دید و مەنطق و دانایی سەیری ئەم شەڕەی ئێران و ئەمریکا بکەین . ئەمریکا عەلمانییە و گوێ ناداتە هیچ قیەمێك ، ئێران ولاتێکی بە ناو ئیسلامییە لە سەرەتای دروست بوونیەوە و 1350 ساڵ لەمەوبەر دروست کراوە بۆ دژایەتی ئاینی ئیسلام و لێدانی .

پرسیاری لۆژیك ئەمەیە :

( ئەمریکا و ئێران شەڕ دەکەن ، بۆچی سعوودیە تێوە گلاوە ؟ )

ئەگەر بڵێن : ئەمریکا پارەی لێدەستێنێت و مەسرەفی شەڕی پێدەکات .

دڵنیابە هیچ لە سیاسەت و لە دنیاش تێنەگەیشتوویت .

چونکە ئەمریکا گرێبەستی هەیە لەگەڵ باپیرە گەورەیان (عبدالعزیز) دامەزرێنەری دەوڵەتی سعوودی .

کە دەبێت بە دایمی پارە بدەن بە ئەمریکا ، لە بەرامبەردا ئەمریکا دەیانپارێزێت و (ئال سعوود) لەسەر حوکم دەبن .

کەواتا سعوودیە بۆچی شاباشی خۆی نادات و قنج هەڵپەڕێت ؟

بۆچی دەکەوێتە شەڕی سەربازییەوە ؟

بۆچی 30\5\2019 کۆمکاری عەرەبی دەبەستێت بۆ ئەم شەڕەی ئێران و ئەمریکا ؟

بۆچی خەڵکی بۆ ئامادە دەکات بە ناوی جیهادەوە ؟

لێرەدا دەوەستم و دەچم بۆ بەری ئەوبەر ...

ئێران ولاتێکی زلهێزە ساڵی 1979 دروست بووە . واتا 40 ساڵە ئێران هەیە .

سعودیة ساڵی 1902 دروستکرا لەسەر دەستی (عبدالعزیز ال سعود) ، لە ساڵی 1932 توانیان هەموو زەویەکانی سعوودیە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان بە یارمەتیی (لورانس العرب( و (بەریتانیا) . واتا 87 ساڵە سعوودیە هەیە .

لە ماوەی 40 ساڵدا ئێران توانیویەتی ببێت بە خاوەنی گەورەترین جبەخانەی ساروخ و سیلاحی قورس و سوك و ئەتۆمیش .

بۆچی (ئال سەلول) تا ئێستا ناتوانن فیشەکێکیش دروست بکەن ؟ بۆچی هیچ دەوڵەتێك حساب بۆ سعوودیە ناکات وەك ئێران ؟ ئەم ئاینی سەلەفیزمە چیان پێشکەش بە ئیسلام و موسوڵمانان کردووە ؟

گەورەترین گورزیان لە ئاینی ئیسلام داوە ، دینێکیان دروست کردووە . ئەمە حەڵاڵە ئەمە حەرامە ، بەڵگەکانیشیان تەئویلاتی خۆیانە . سادەترین نموونە :

دەڵێن ئافرەت جائیز نیە بە هیچ شێوەیەك بچێتە دەرەوە, تەنها لەبەر کاری زەروورەت نەبێت .

ئێ باشە دڵپیسی دەشتەکی . کاتێك ژنەکەت منداڵی دەبێت داوای دوکتۆرەی ئافرەت دەکەیت . ئەگەر نەهێڵیت ئافرەت بچێتە دەرەوە و بخوێنێت چۆن ئافرەتی دکتۆرە دابین دەکەیت بۆ ژنە حامیلەکەت ؟

ئەگەر لەگەڵ ژنەکەت چویتە دەرەوە و کەسێك گوتی ئەو ژنە دزی کردووە . یان شتێکی خستە گیرفانی بەبێ ئەوەی پێبزانێت , وە بیکات بەهاوار بڵێت ئەو ژنە شتی لێ دزیم ، پاشان چوون بۆ بنکەی پۆلیس . کێ تەفتیشی ژنەکەت بکات ؟ نابێت ئافرەتێکی پۆلیس هەبێت ؟

ئێمە ئێستا لەبەردەم دوو هێز داین :

**یەکەم :** (سعوودیەی عەرەبی).. کە لای دانیشتوانی سەر زەوی مەرجەعە بۆ ئاینی ئیسلام . چونکە ژمارەی دانیشتووانی سەر زەوی دەچێتە نزیکەی هەشت ملیار . ئێمەی موسوڵمان کەمینەین و ملیار و قسورین . میدیای جیهانی و خەڵکی لە جیهان پێوەریان بۆ ئیسلام سعوودیە و عولەمای سعوودیەیە .

**دووەم :** بەهەمان شێوە ئیسلامییە ( کۆماری ئیسلامیی ئێران ) ئەم دەوڵەتەش لای جیهان بە دەوڵەتێکی مەزنی خاوەن دەسەڵات و ناسراوە .

منەتی نییە بە ئەمریکا و بە جیهان چەندین ساڵە حیصاری لە سەرە لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کاریگەریی نەبووە لەسەری و بەهێزتر بووە نەك بێهێز بێت .

خاوەنی چەکی ئەتۆمییە ، هەموو جیهان حسابی تایبەتی بۆ دەکەن . لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا یەکەم هێزە لە هەموو بوارەکان دا .

لەسەر ئاستی جیهانیش هەر ولاتێکی زلهێز بێتە ناوچەی ڕۆژهەلات, حساب بۆ هێزی ئێران دەکات لە هەموو ڕوویەکەوە . کەواتا یەکەم ولاّتی زلهێزە لە ناوچەکەدا و بەبێ ڕێك کەوتن لەگەڵ ئێران هیچ زلهێزێك ناتوانێت لە ناوچەکەدا یاری بکات .

ئەوە سووریا باشترین نمونەیە . ڕووسیا بە هەموو هێزێکیەوە دەبێت لەگەڵ ئێران ڕێك بکەوێت .

سعودیة وەك دەوڵەتێکی ئیسلامی لە هەموو جیهاندا ناسراوە بەوەی . ئەمانە موسوڵمانن و مەرجەعی ئاینی ئیسلامن و لە مەککە و مەدینە حوکم دەکەن بە حوکمی قورئان و ئیسلام , بەلام مافی مرۆڤ نادەن بە گشتی و مافی ئافرەتیان خواردووە و ئافرەت وەك کاڵا سەیر دەکرێت .
لە بەرامبەریشدا لەسەر ئاستی ناوچەکە و جیهانیش . سعودیە و ئاینی سعودیە وا ناسراوە ئەمانە سەر پەرشتی گروپە جیهادییەکان دەکەن . لە هەر جێگایەك بەناو جیهاد هەبێت ڕێژەی سعودییەکان زۆرترین کەسن کە دەچن بۆ ئەو ناوچەیە بۆ جیهاد و تەقاندنەوە .

کرۆکی شەڕی نێوان ئەمریکا و ئێران لێرەدایە . ئەمریکا دەوڵەتێکی عەلمانی سەرمایەدارە ، ئامانجی سەرەکی سووککردنی ئاینی ئیسلامە و لێدانی قورئان و سوننەتە . لە دوای هەردوو جەنگی جیهانی کار بۆ لەناو بردنی ئاینی ئیسلام دەکرێت .
باشترین کەسیش بۆ ئەو کارە سعودیە بووە . دەوڵەتی عوسمانی پێ ڕووخاندووە . وە پاش دەوڵەتی عوسمانی (ئیخوان موسلیمین) , پەیدا بووە وەك هێزێکی ئاینی بۆ هەستانەوەی ئیسلام و سعوودیە هەتا ئێستاش لێیان دەدات و ناهێڵێت ئەو هێزە ئیسلامییە سەر هەڵبدات .

ئاینێکی تەقلیدی کاثۆلیکییان دروست کردووە بە ناوی سەلەفییەوە . ئەم ئاینە کاری ئەوەیە بە ناوی ئەوەی ئاین دەبەنەوە سەر ئەسڵی ئاینەکە . بۆ ئەم کارەش هاتوون تەئویل دەکەن ، واتا دەقەکانی قورئان دەهێنن لەگەڵ حەدیس . شیکاری بۆ هەردووکیان دەکەن .
لەسەر ئەو شیکارییە دەڵێن ئەمە حەرامە و ئەوە حەڵاڵە . لێرەدا دەبێت ئاگاداری ئەم خاڵە بین :

ئەوەی سەلەفیزم حەلاڵ و حەرامی دەکات ، ڕا و بۆچوونی زانایانی سەلەف نییە . هەر چوار مەزهەبەکەش ئەو شتەیان حەلاڵ و حەرام نەکردووە .
بۆ ئەوەی شارەزا بین لە درۆ و چەواشەکاریی ئەم سەلەفییانە . بۆ هەر حەلاڵ و حەرامێك داواین لێبکەن :
کام لەو چوار مەزهەبە گوتوویانە حەرامە و بەڵگەکەشت بۆ دابنێن .
سەیری بەڵگەکانیان بکە هیچی قسەی (امام احمد یان شافیعی یان مالیکی یان حەنەفی) نییە بە ڕەحمەت بن .
وە هیچ کام لەو چوار ئیمامە نەیان گوتووە ئەمە حەرامە . ناتوانن یەك دەقی صریح بهێنن لە کتێبی ئەو چوار ئیمامە.

ئەم سەلەفیانە وەك شیعەکان دێن لە کتێب و سەرچاوەکان دەگەڕێن . ڕیوایەتەکان دەهێنن و دەڵێن بەگوێرەی ئەمانە فلان شت حەرامە و جائیز نییە .

پرسیاری سەرەکی ئەمەیە :
( ئەو سەرچاوانەی تۆی مەدخەلی دەیکەیت بە بەڵگە پێش تۆش هەبووە . بۆچی ئەو چوار مەزهەبە نەیان کردوە بە بەڵگە ؟ )

بۆچی لە مێژووی ئیسلامدا ئەم حەلاڵی و حەرامییە نەبووە و لە دوای جەنگی جیهانییەوە سەریان هەڵداوە ؟
ئەم سەلەفیانە هاتوون خۆیان شیکاری دەکەن بۆ دەقەکانی قورئان و حەدیسەکان ، دایدەڕێژن وەك قاڵب و دەڵێن ئەمانە بەڵگەیە بۆ حەرامیی فلان شت .
پێیان بڵێ کێ پێش ئێوە ئەم شتەی حەرام کردووە ؟
کەسیان ناتوانن بەڵگە بهێنن . بەڵکو کۆپی و پەیستی شێخەکانی سعودیەت بۆ دەهێنن هی زەمانی (لورانس العرب)

لەوەش گرینگتر ئەوەیە :

وەك دەزانن قسە و ڕەخنەیەکی زۆر هەیە لە لایەن هەموو جۆرەکانی بێ باوڕان و دژە ئیسلام لەسەر ئاینی ئیسلام .
هیچ وشەیەك نەماوە لە قورئان ڕەخنەی لێ نەگیرا بێت . هیچ حەدیس و کتێب و سەرچاوەمان نییە ڕەخنەی لێنەگیرابێت و قسەیان بۆ هەڵنەبەستبێت .
ئێمەش وەك موسوڵمان دەبێت هەڵوێستمان هەبێت و وەڵام بدەینەوە . دەبێت ئەو ڕەخنە و قسانە بەدرۆ بخەینەوە .

ئەم کارەش کارێکی ئاسان نییە . خەڵکی تایبەتی شارەزای دەوێت چونکە هەموو کەس ناتوانێت وەلامیان بداتەوە .
دەبێت ئەو کەسانە سەنتەری تایبەت و مووچە و هەموو پێداویستییەکیان بۆ دابین بکرێت .
ئەوانەی ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن دەزگای گەورەی نێو دەوڵەتی و ئیزاعەی تایبەتییان هەیە . پارەیەکی زۆریان بۆ سەرف دەکرێت . هەر موسوڵمانێکیش خۆی تەرخان بکات بۆ وەلامدانەوەیان . دەبێت دەوڵەت هیچ نەبێت بژێوی ژیانی ئەو کەسانە دابین بکات بۆ ئەوەی بەردەوام بن لە وەڵامدانەوەی ئەو گومانانە و خەریکی کاری تر نەبن بۆ بژێوی ژیانیان .

دەوڵەتی سعوودی و ئاینی سەلەفیزم لە دەرەوەی دەوڵەتی سعوودیە ئامۆژگاری بۆ هەوادارانی ئەوەیە :

نابێت بچنە ئەو سایت و کەناڵ و پەیج و گروپانەوە . جائیز نییە تێکەلاویان ببن ئەگەر ئەهلی عیلم نەبن .
منیش دەڵێم هەی (ئاینی لۆرانس) ، ئادەی پێمان بڵێ : چەند سەد کەست لە ئەهلی عیلم ئامادە کردووە بچێتە ناویان و وەڵامیان بداتەوە ؟
ئادەی پێم بڵێ چۆن نەچمە ناویان ؟ لە کاتێکدا من دەچمە یوتوب لە تەنیشتەوە جۆرەها ڤیدیۆم بۆ دەهێنێت .
فەیسبوك و تویتەر و هەر بەرنامەیەکی تری ئینتەرنێت بکەمەوە جۆرەها بەرنامە و پۆست ئۆتوماتیك دێتە سەر شاشەکەنم و پۆستی بەرامبەر دەبینم .

ئەقڵی ئەشکەوتی تۆ هێندە لە دوایە ، نازانیت من ناچمە ناویانەوە بەڵکو ئەوان دێنە ناومانەوە و هەرکەس ئینتەرنێت بەکاربهێنیت بەبێ ویستی خۆی پۆستی دژە ئیسلام و شتی ڕووت و جۆرەها شت دێتە سەر شاشەکەی .
هۆ کاکی ئەشکەوتی تۆ لە کوێ دەژیت ؟ ئایا بێ ئاگایت لە جیهانی نێت ؟

گورزی گەورەی (ئاینی لۆرانس) لێرەدایە :
کاتێك سەلەفیەکی کچ یان کورِ ، دێتە جیهانی نێت و پۆستی دژە ئیسلام دێتە سەر شاشەکەی . وەك مرۆڤ هەستی فزوڵی دەجووڵێت و کلیك دەکات بزانێت چی باسە ؟
ئەم داماوە نازانێت وەلام بداتەوە .
دەچێت بۆ لای مامۆستاکەی پرسیاری لێدەکات . مامۆستاکەی لە تەلەبەکە داماوترە نازانێت وەڵامی بداتەوە . پێی دەڵێت: جائیز نییە بچیتە ناویان .
ئەم داماوە جارێك و دووان و سیان.. هتد ... پۆستی دژە ئیسلام دەبینێت وەلامی لا نییە .

کاتێك بە توانا و تێگەیشتنی خۆی وەلام دەداتەوە . بەرامبەر دەیکات بە کێودا و شرِ و شیتاڵی پێوە ناهێڵێت . وردە وردە ئەو سەلەفییە داماوە بەرەو بێدینی و ئیلحاد دەرِوات چونکە وەڵامی پرسیارەکانی لا نییە .

مامۆستاکانیشی بێ عیلم و موفلیسن . شێخەکەیان دەڵێت: تۆ چییت رِەخنە لە خوا بگریت ، یان دەڵێت تۆ چی دەزانیت ؟

شێخ مەهزەلە.. ئاگاداریت زۆربەی سەلەفیەکان بوون بە بێدین چونکە تۆ وەلامت پێ نییە ؟

ئەمەش بەشێکە لەو ئاینەی لۆرانس بۆی داناون . نابێت وەلامی دژایەتییەکان لەسەر ئاینی ئیسلام بدەنەوە . نابێت بچنە کۆرِ و کۆمەڵی دژە ئیسلامەوە .
وەك دەبینن ئەمە خۆی لە خۆیدا لاوازی و بێهێزیی ئاینی ئیسلام یان هەر مەنهەجێکیترە کە نەتوانێت وەلامی بەرامبەر بداتەوە .

لە بەرامبەریشدا ، (وەلی ئەمر) لەناو سعودیە و دەرەوەی هێڵی سوورە . هەر کەس قسەیان پێ بڵێت هێزی چەکداری بۆ دەنێرن . فەتوای لەسەر رِەقەم دروست دەکەن ئەو کەسە کافرە زندیقە مبتدعە .
لەناو خۆیاندا یەکتر ئاگادار دەکەنەوە و سووك و سەلیمی دەکەن خۆی و ژن و کچ و شەرەف و ناموسی دەبەن . بە حیزانە دەچن دەنگی تەسجیل دەکەن و دوای بلاّوی دەکەنەوە .

ئەمەیە دینی وەلی ئەمر . نەك دینی خودا ..
بۆ خودا بێدەنگن ، بۆ وەلی ئەمر دەنگیان نیرە . لە هەر جێگایەك بن سەرۆك وەلی ئەمریانە ئەگەر هیندۆس و بودای بێت یان مانگا پەرست بێت .
ئەمەیە دینی (لۆرانس العرب) لە جەنگی جیهانیدا هیندستانی داگیر کردبوو . لەگەڵ ئەوەشدا هیندیی دەکرد بە سەرباز و ولاتی تری پێداگیر دەکردن .
دەوڵەتی عوسمانییان بە شەریفی مەککە و ئال سعود رِووخاند, فێریشیان کردن هەتا دەمرن دەبێت کۆیلەی ئینگلیز بن و ژێر دەستەکانیشیان فێر بکەن کۆیلە بن لە هەر جێگایەك بن .

مامۆستا کرێکار دەڵێت : ئەم ئێرانیانە بە فارس و کوردەوە لە ئەوروپا فاسدترین ڕەوەندن لەناو هەموو ڕەوەندە ئیسلامی و نا ئیسلامیەکان دا .
چونکە ئەوان دینیان لە ڕێگەی شیعەوە وەرگرتووە و خودایان لە دیدی شیعەوە ناسیوە . بۆیە کاتێك دێن بۆ ئەورپا و جێگیر دەبن . لە هەموو بەهایەکی ئەخلاقی و کۆمەلأیەتی دادەماڵرێن . بە پێوەری ئاینی و تەنانەت مرۆیی , وەك مرۆڤێکی ئاسایی مامەڵە ناکەن بە پێوەری قیەم و ئەخلاقی ئەورووپیەکانیش ئەو شتانەی دەیکەن و دەیڵێن تاکی ئەورووپی وەك مرۆڤ قبوڵی نییە .

منیش دەڵێم : لەوەتەی بن سلمانیش کراوە بە جێنشین ، هەمان سیناریۆ لە سعودیە بلأو بووەتەوە .
بەلأم جارێ لە سەرەتادایە و لەم سالأنەی داهاتوو دەبینین . ئەوەی سعوودی دەیکات ئێرانییەکان شەرم دەکەن بیکەن .
هۆکاری نەمانی ئەو قیەمانەش ، فەتوای زانایانی سەلەفیزمی خێڵەکییە بە ناوی ئیسلامەوە لەسەر ئافرەت و پێگەی ئافرەت .

ئاینی ئیسلامی مەزن بێبەریە لەو دینە و لەو مامەڵەیە لەگەڵ ئافرەت دا . خۆتان بینیتان چۆن ئافرەتی سعوودی ڕادەکات و ئەگەر مەجالیان بدرێتێ زۆرینەی کچ و ژنیان هەڵدێن لە سعوودیە .
باسی شتی شارداوە ناکەم لەناو ماڵەکان لەگەڵ خزمەتکاری هیندی و بەنغالی و.. هتد ...

شیعە و سەلەفی دوو ڕووی یەك دراون , لە ناشیرین کردنی ئاینی ئیسلامدا لە ڕووی مامەڵە کردن لەگەڵ ئافرەتدا.
ئەم کارەش دەبێتە هۆکاری ئەوەی ئافرەت دژایەتی دین بکات و بە ڕاستی نەزانێت .
لە کاتێکدا گەر لێکۆڵینەوە بۆ ئەو فتوا و یاسا و ڕێسایانە بکەین . هیچیان بە پێوەری ئیسلامی نین . بەڵکو بە پێوەری یاسای خێڵەکیی سعوودیە, کە بە قورئان و سونەت شەرعاندوویانە و تەئویلیان بۆ کردووە .

گورزێکی تر لە داهاتوودا کە لە ئاینی سەلەفی پێ لێدەدرێت ئافرەتەکانیانە . لە ڕێگای ئەوانەوە 70٪ی ئاینی سەلەفیزم پووچەڵ دەکرێتەوە .
لەم پێنج ساڵەی داهاتوو ببینن چۆن زاناکانیان لە ناوەوە و کلکەکانیشیان لە دەرەوە فەتوا کۆنەکانیان پوچەڵ دەکەنەوە و زۆر بە بێ شەرمی جارێکی تر ملی ئایەت و حەدیسەکان دەشکێننەوە لەژێر شەقی ئەمریکا دا بەناوی چاکسازی و پێکەوە ژیانەوە .

ئەمەش بەشێکی تری ئەو یاریەی نێوان ئەمریکا و ئێرانە . بەم شێوەیە ئاینی ئیسلام سووك دەکەن لەبەر چاوی موسوڵمان و نا موسوڵمان . خەڵکی متمانەیان بە ئایەت و حەدیس نا مێنێت .
ئەمەیە پیلانی (لۆرانس), ئینگلیز ئاقڵن و پلانی درێژ خایەنیان هەیە .
خاوەنی ئەزموونی کاثۆلیك و پرۆتستانتن و دەزانن چۆن یاری بە ئاین دەکەن .

لە سعوودیە لە ڕێگای وەهابیەکانەوە پاپاکانیان دروستکرد و دینێکی کاثۆلیکیان دامەزراند .
ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە (مارتن لوثر و کالڤن) بێنە ساحەکە و کاثۆلیك و ئاینی تەقلیدیی کاثۆلیك و پاپاکان بگۆڕن . دەبێت کێ دەوری مارتن لۆثەر و کالڤنی سعوودی ببینێت ؟
ئاخۆ کەی دەسەڵاتی (ئال سەلوول) وەك ڕۆمی کاثۆلیك لە (فاتیکان) بچووك بکرێتەوە و (ریاض) بکرێتە فاتیکان ؟ وە ماباقی سعوودیە بە دەست پرۆتستانت بێت !

چاوەڕوانی کەشف کردنی مەلەفاتی سێکسی ئەم ئال سەلوولە و موفتیەکانیان بن . وەك چۆن مەلەفی سێکسی کڵێساکانی کاثۆلیك بڵاو کرایەوە .

بەڕێزان کاتێك (ڕۆتانای ترابزۆنی – ئەو کچەی ڤیدیۆکە کە بەئەسڵ سعودییە)[1] چەند هەفتەیەك لەمەوبەر بە نیمچەڕووتی قورئانی خوێند. خەڵکی زۆر هێرشیان بۆ کرد، کەسیان خوێندنەوەیان نەبوو بۆچی ئەم کچە وادەکات ؟ ڤیدیۆی ئەم کچە چەند تەوەرێکە و ئاماژەیە بۆ کەڵەکە بوونی ئاینی کاثۆلیکی وەهابی .
سەرەتا پشتی لە جمهوورە و سەماکەشی هەمووی پشتی لە جمهوورە . ئاماژەیە بۆ پشت کردنە کۆمەڵگا .

سەیری سەماکەی بکەن ، ئەوە سەما نییە و بۆ خۆشی نییە . بەڵکو سەمایەکە عەبەسیەت و ڕق و کینەی خۆی دەردەبڕێت و هێندە شلەژاوە نازانێت ڕوو بکاتە خەڵکەکە یان پشتیان تێ بکات ؟ ئەمەش مانای ئازار و ئەشکەنجەی کۆمەڵگایە و ئەم ئافرەتەی بەرەو بزربوون بردووە . کاتێك قورئانەکە دەخوێنێت مۆسیقاکە ڕادەگرێت . ئاماژەیە بۆ ڕێز و حورمەتی بۆ قورئانەکە و بە خەڵکی دەڵێت : مەمبینن ڕووتم و سەما دەکەم . منیش وەك ئێوە موسوڵمانم و قورئان دەخوێنم . من گاڵتە بە قورئان ناکەم . بەڵام نارەزایی خۆم دەردەبڕم لەم دینە .
بەڵێ بەڕێزان هەموو موسوڵمان بە چاوی ناشرین و قسەی خراپ قسەیان لەسەر ئەم کچە کردووە .
بەڵام هیچیان باسی هۆکاری ئەم کارەیان نەکردووە . کە دینی سەلەفیزمی سعوودی سووکایەتی بە ئافرەت دەکەن بەناوی ئاینەوە .

ئەم ئافرەتەش بە ئسلوبی خۆی دەڵێت: من موسوڵمانم سەد ساڵە سەلەفیزم ناهێڵن سەیارە لێبخووڕم , لە کاتێکدا دەرەوەی سعوودیە ئەوانیش موسوڵمانن و ژنەکانیان سەیارە لێدەخووڕن .

ئەم کچە دەڵێت: من موسوڵمانم ناهێڵن بچمە دەرەوە لەبەر زەروورەت نەبێت . لەکاتێك کچانی ولاتانی تری ئیسلامی هەموو کات بۆیان هەیە بچنە دەرەوە .

ئەم کچە دەڵێت: من موسوڵمانم ناهێڵن بە دڵی خۆم جل بپۆشم و دەبێت خۆم بپێچم لە عەبایەکی ڕەشەوە . لە کاتێك دا کچانی تری ولاتانی تر موسوڵمانن و تەنها لەچکێکیان بەسە بۆ چوونە دەرەوە .

---

[1] : لینکی ڤیدیۆکە : https://www.facebook.com/sardar.karem.714/posts/1249535705220568

بەڵێ بەڕێزان کاتی ئەوە هاتووە ئەم دینی سەلەفیزمە لە ڕەگ و ڕیشەوە پووچەڵ بکرێتەوە .
هەمان ئایات و حەدیس کە دایان نابوو بۆ حەرامی هەموو شتەکان . هەر بە خودی زانایانی خۆیان ئەو ئایات و حەدیسانە بە درۆ بخەنەوە .

هەتا پێنج ساڵی تر دەبینن ئاینی ئیسلام چۆن دەشێوێنرێت و چۆن سەر لەخەڵکی تێك دەدەن و نازانن کام ئایەت و کام حەدیس ڕاستە !
ئەمە کۆتا ئامانجی (لۆرانس)ە لەو پلانە سەد ساڵەییە دا .
خۆشتان دەبینن چۆن حەرامەکان حەلاڵ دەکەن ئەو ئایات و حەدیسانەی دینیان پێ حەرام دەکرد, جارێکی تر هەڵیدەوەشێننەوە .

ئەوەی قازانج دەکات ئێران و ئەمریکایە , ئاینی ئیسلامت بۆ سووك دەکەن بە زانایانی (لۆرانس العرب) .
ئاگاداربە کە دەڵێم ئاینت بۆ سووك دەکەن مەبەستم لای بێ دین و دژە ئیسلامەکانە .
مەبەستم لای زۆرینەی خەڵکی جیهانە کە وا دەزانن سعوودیە سەرچاوەی ئاینی ئیسلامە . مەبەستم لای میدیاکانە .

الحمدلله موسوڵمانی باش ماوە کە دەزانن سەلەفیەت واتا سووکایەتی بە ئیسلام لە ڕێگای ئەقڵی ئەشکەوتی و فەتوای کۆپی و پەیستەوە .

هەموو جیهان وا دەزانن ئەمریکا و ئێران شەڕ دەکەن ، چاوەڕوانن بزانن کامیان یەکەم تەقە دەکات و شەڕەکە گەرم دەبێت . ئەوەی سەیرە سعوودیە و ئیمارات خۆیان سەغڵەت کردووە .
کەواتە شەڕەکە لە نێوان ئێران و ئەمریکا نابێت ، بەڵکو لە نێوان ئێران و سعودیە دەبێت . ئێران و سعوودیەش ڕاستەوخۆ شەڕ ناکەن ، بەڵکو لایەنی تر لەبری ئەوان شەڕ دەکەن .

ئامانجی سەرەکی ئەم شەڕە کۆتا بزمارە لە تابووتی ئاینی ئیسلام دەدرێت . چونکە ئەمریکا و زلهێزەکان لەمێژە دەیانەوێت ئاینی ئیسلام لەناوبەرن .
ئەو کاتە ئیسلام بێهێز بوو و نەما کە دەوڵەتی عوسمانییان ڕووخاند . چونکە بوونی دەوڵەتێك زۆر گرنگە بۆ پارێزگاری کردن لە هەر ئایدیایەك یان ئاینێك . ئەو دەوڵەتە دەتوانێت خەڵك کۆبکاتەوە بۆ دامەزراندن و بەرەو پێشچوونی ئەو دەوڵەتە و دەبێت بە پارێزگاری ئەو ئاینە یان ئەو فکرە .

یەکەم گورزیان ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی بوو بە هاریکاری (ئال سعوود و لورانس العرب) . ئەگەر ئەم عەرەبە پێ پەتیانە پشتگیری ئینگلیزیان نەکردایە و شەڕیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی بکردایە ، هاوسەنگی جەنگی جیهانی دەگۆڕرا و ئەمریکا و ئینگلیز سەر نەدەکەوتن .

پاش ئەوەی کە زانییان ئەم عەرەبە پێ پەتیانە خائین و خۆ فرۆشن ، هاتن ئاینی ئیسلامیان پێ گۆڕین .
ئەم گۆڕانکاریە هەرهەموومانی تێکەوتووین لە موسوڵمانێکی عەوامەوە کە بە تەنها دەزانێت نوێژ بکات هەتا زانایان و بانگخوازان و موفتیەکانیشمان لە هەرهەموو ولاّتە بەناو ئیسلامییەکان . بۆتان باسدەکەم و تووشی شۆك دەبن .

لای هەموو موسوڵمانێك ئاینی ئیسلام ڕای جیاوازە و بۆ هەموو حوكمێكی شەرعی و حەلاّڵ و حەرامێك ڕای جیاواز زۆرن و عولەما خیلافیان هەیە .
من و تۆی موسوڵمان ئەساسی ئاینەکەمان لەسەر ئەو قسەیەی سەرەوە داناوە .

ئێستا هەر یەکێك لە ئێوە ئەم پرسیارە لە خۆتان بکەن :
هەرهەمووتان منداڵتان هەیە لەناو ماڵدا یان منداڵی خۆتانە یان خوشك و براتانە .
ئەم مندالاّنە دەبن بە حەوت ساڵ ، دەبێت بچن بۆ قوتابخانە . کام لە ئێوە ڕازیە منداڵەکەی بچێت بۆ قوتابخانەیەك رای جیاوازی تێدا بێت لە جۆری وانەکان و هەر مامۆستایەك بە ئارەزووی خۆی وانەیان پێبڵێت و خیلاف هەبێت لە نێوان مامۆستاکان و ئیدارە , بۆ دەرس گوتنەوە ؟

وەلاّم : هەر هەمووتان دەڵێن: کەسمان ڕازی نیین و منداڵمان نانێرین بۆ ئەو مەکتەبە .

ئێستا ئەم پرسیارە لە خۆتان بکەن :
ئەی بۆچی ڕازین کە حوکمی خودا و ئاینەکەتان ڕای جیاوازی تێدابێت و عولەما ڕێك نەکەون لە نێوانیاندا کام حوکمەی خودا ڕاستە ؟
بۆچی ئێمەی مرۆڤ دەتوانین ڕێگری لەوە بکەین منداڵمان پەروەردە نەکرێت لە جێگایەك ڕای جیاوازی تێدا بێت .
بەلاّم خودا و مەنهەجی خودا هێندە لاواز بێت نەتوانێت ڕێگری بکات لەوەی ئاینەکەی ڕای جیاوازی تێدا بێت ؟
بۆچی ئەم خودایە (و العیاذ باللە) هێندە بێ دەسەلاّت بێت , نەتوانێت ئاینێکمان بۆ دابەزێنێت .
ڕای جیاوازی تێدا نەبێت و هەر هیچ نەبێت سەیری ئێمە بکات و لێمان فێر بێت . چۆن ناهێڵین منداڵمان بە ڕای جیاواز فێر بێت با خوداش بتوانێت لە ئێمەوە فێر بێت و ڕای جیاواز نەهێڵێت .

پرسیارێکی تر لە خۆت بکە :
ئایا پێش هاتنی سەلەفیزم و لۆرانس العرب ، ئاینی ئیسلام بەم شێوەیەی ئێستا بوو ؟
ئایا پڕ بوو لە رای جیاواز و وەك ئێستای ئێمە بوون و هەر یەکەو لە ئاوازێك دەیانخوێند ؟
وەلاّم : نازانم..! لەوانەیە وا بووبێت.. تا ئێستا ئەو پرسیارەم لە خۆم نەکردووە....

ئەم پرسیارە هەمووتانی شۆك كرد . چونكە دەزانم زۆرینەی هەرە زۆرتان شارەزای دینەكەتان نین بە گوێرەی پێویست. ئەوەش شتێکی ئاساییە و بە خاڵی لاواز حساب ناکرێت .

چونكە ئەو دیاردەیە لە هەموو منهجێکی ئاینی و دنیایشدا هەیە . تەنانەت لە کارگەکانیشدا هەیە و کابرا چەند ساڵە کار دەکات و هەموو کارەکان نازانێت .

ئەوەی ئێستا گرینگە بیزانن ئەوەیە.. ئەم خیلافاتانە و ئەم ڕا جیاوازنە کەی و چۆن هاتە ناو ئاینی ئیسلامەوە ؟
دەبێت سەرەتا باسی چۆنیەتی گەیاندنی پەیامی ئاسمان بکەین بۆ مرۆڤ .
خودای خاوەن دەسەلآت کەونی خەلق کردووە ، پاشان مرۆڤی خەلق کردووە . یەکەم پەیامی خودا بۆ مرۆڤ ڕاستەوخۆ بووە و ئەویش بۆ ئادەم بووە (علیە سلام)... (وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ..) .

کەواتا ئادەم (علیە سلام) هەموو یاسا و ڕێساکانی زانیوە . وە مامۆستا و فێرکەری, زاتی گەورەی (الله) بووە .

نەوەکانی ئادەم سەرپێچیان کردووە ، خودای زانا پەیامبەرانی ناردووە یاسای خودایان فێر بکات .

خاڵی گرنگ لێرەدایە :
ئەم پەیامبەرانە فریشتە پەیامەکەیان پێگوتووە . پەیامبەرەکەش بە خەڵکی ڕاگەیاندووە . واتا پەیامبەر قسەی کردووە و خەڵکەکە زانیویانە چی دەڵێت .
بۆ نمونە ئەگەر (مەهدی) کورد بێت ، کوردیش بەس (سۆرانی) بن . کاتێك مەهدی دێت قسە دەکات هەمووان دەزانین چی دەڵێت و پەیامی خودا چییە بۆمان و چی بکەین حەلاڵە و چی نەکەین حەرامە .
ئایا ئێمە کەسمان پێویستیمان بە موفەسیرە ؟ یان خۆمان ڕاستەوخۆ دەزانین مهدی چی دەڵێت ؟..
ئایا رای جیاوازمان دەبێت ؟ یان هەمومان 100٪ دەزانین چی گوتووە ؟

ئەگەر یەکێکیش بە هەڵە حاڵی بووبێت , هەزار کەسمان بۆی راست دەکەینەوە . چونکە زۆرینەمان تێدەگەین کە چی گوت .

جاران دنیا بچووك بووە ، پەیامبەران پەیامەکانیان زارەکی گەیاندووە .
وردە وردە دنیا گەورە بووە خەڵکی زۆر بوون ، بۆیە خودا پەیامی بە نوسین ناردووە بۆ مووسا (علیە سلام) .
وە ئەم نووسینەش چەند لاپەڕەیەك بووە نەك کتێبێك بێت وەك قورئان .
سەیر لێرەدایە.,, ئەم کتێبی تەوراتە نەدراوەتە دەست جوولەکە پاش مردنی مووسا (علیە سلام) .

وە پێشتر پۆستێکم کردووە لەو بارەیەوە ..

لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/groups/1683635728590809/permalink/2165148923772818/

دەقی پۆستەکە :

((ئەم کتێبی تەوراتەی بەردەستمان هەمان کتێبی مووسا نییە (علیه سلام) .

چونکە لە تەورات سفر التثنیة دوا وتار بەشی 31 دەقی 24 هەتا 29 دەڵێت :

24 – لەدوای ئەوەی موسا بە تەواوی لە نووسینی وشەکانی ئەم فێرکردنە بووەوە لە پەڕتووکێك .

"دیقەت بدەن لێرەدا ئەم کتێبە مووسا نەی نووسیوە . گەر ئەو بینووسیبایە دەیگوت: لەدوای ئەوەی لە نووسینی وشەکانی ئەم فێرکردنە بوومەوە لە پەرتووکێك . سەیری دەقەکانی دوای ئەو بکەن دەڵێت: موسا (علیه سلام) ئەو کتێبەی نەدا بە جووەکان" ...

25 – فەرمانی بە لێڤییەکانی هەڵگرانی سندوقی پەیمانی یەزدان کرد و گوتی

26 – ئەم پەڕتووکەی تەورات ببەن و لەتەنیشت سندوقی پەیمانی یەزدانی پەروەردگارتان دایبنێن، هەتا وەك شایەتی بەسەرتانەوە لەوێ بێت،

27 – چونکە من یاخیبوون و کەللەڕەقیتان دەزانم. من وا هێشتا زیندووم و ئەمڕۆ لەگەڵتانم، ئێوە بەو شێوەیە بەربەرەکانێی یەزدان دەکەن، ئەی باشە لەدوای مردنم چی دەکەن!

28 – هەموو پیرانی هۆزەکان و کوێخاکانتانم بۆ کۆبکەنەوە، هەتا ئەم وشانەیان بەگوێدا بدەم، ئاسمان و زەوی بکەم بە شایەت بەسەریانەوە،

29 – چونکە دەزانم ئێوە دوای مردنم بە تەواوی گەندەڵ دەبن و لەو ڕێگایە لادەدەن کە فەرمانم پێ کردوون. لە ڕۆژانی ئاییندە تووشی خراپە دەبن، چونکە لە بەرامبەر یەزدان خراپە دەکەن، بەو بتانە پەستی دەکەن کە بەدەستی خۆتان دروستی دەکەن.

“وەك دەبینن بە گوێرەی کتێبەکەی خۆیان مووسا تەوراتی (علیه سلام) نەداوەتە دەستیان. چونکە گەندەڵن و لە ڕێگای موسا لادەدەن .

ئەگەر دەڵێن : ئەم نوسخەیەی بەردەستمان هی مووسایە (علیه سلام) . دەڵێم : کتێبەکەی خۆتان دەڵێت :

مووسا (علیه سلام) پێش مردنی ئەو کتێبەی خستووەتە (صندوق العهد)ەوە . وە تا ئێستاش ئێوە دەگەڕێن بە دوای (صندوق العهد) دا بۆ ئەوەی بیدۆزنەوە و شکۆی جوو بگێڕنەوە .. ))

ئەمەی باسمانکرد مانای چییە ؟

مانای ئەوەیە کتێب و پەیامی مووساش(علیە سلام) , وەك پەیامبەرانی پێش خۆی . بوو بە زارەکی و جوولەکە دوای مووسا (علیە سلام) نەوە دوای نەوە تەوراتیان بە زارەکی نەقڵ کردووە .

نەقڵ کردنی زارەکی هەڵەی زۆری تێدا دەکرێت ، دەتوانرێت زیاد و کەم بخەنە سەر پەیامەکە . لێرەدا ئاینەکە ئەسڵیەکە بزر دەبێت .

بۆیە خودای زانا عیسای کوڕی مەریەمی نارد (علیهما السلام) کاری ئەوە بوو ، جوولەکە بگێڕێتەوە بۆ ئەسڵی تەوراتی مووسا (علیە سلام) کە لەبەر دەستیان نەمابوو .

واتا ئینجیل کتێبێکی سەربەخۆ نییە ، بەڵکو ڤێرژنی تازەی تەوراتە . ئەم کتێبی ئینجیلەش بزرە و دیار نیە . ئینجیلی عیسا (علیە سلام) بوونی نییە ، بەڵکوو ...

ئینجیل بە گوێرەی مەتا . ئینجیل بە گوێرەی لۆقا . ئینجیل بە گوێرەی مەرقوس . ئینجیل بە گوێرەی یوحەنا ...

ئەم چوار ئینجیلەش هیچ شەرعێکی خودای تێدا نییە . بەڵکو سەرگوزشتە و ژیان نامەی مەسیحە (علیە سلام) .

دەتوانین بڵێین ئاینی جوولەکە و مەسیحی رای جیاوازی تێدایە بە ئارەزووی خۆت عیبادات و حەلاڵی و حەرامی دانێ هیچ کێشەیەك نییە . چونکە نوسخەی ئەسڵی ئەم کتێبانە دیار نییە و بوونی نییە .

کاتێك قورئان دابەزیوە خۆشەویست (ﷺ) خوێندوویەتیەوە ، خەڵکی هەموو لێی تێگەیشتوون , زانیوانە مەبەست چییە و داوای چیان لێدەکرێت .

زەمانی خۆشەویست (ﷺ) ڕای جیاواز نەبووە و موفەسیریش نەبووە , خەڵکەکە ڕاستەوخۆ زانیویانە پەیامی خودا چیە.

دوای مردنی خۆشەویست (ﷺ) و هاوەڵان ، ئەم ئاینە گەیشتووەتە نیوەی جیهانی کۆن . خەڵکی ئەو شوێنانەی ئاینی نوێیان پێگەیشتوە لەژێر دەسەڵاتی ڕۆم و فارس دابوون . ئاینی ئاگر پەرستی و گاور و وەسەنی و جۆرەها ئاینی تری تێدا بووە . وەرگرتنی ئاینی نوێ ڕووبەڕووی پرسیاری زۆر بووەتەوە لە لایەن خەڵکی ناوچەکانەوە .

نوسخەی ئەسڵی قورئانەکە بە نووسین هەبووە ، بۆیە کێشەی زۆر بۆ ئاینی ئیسلام دروست نەبووە . بەڵکو خەڵکە تازەکە هاتوونەتە ئاینی ئیسلامەوە . بەڵام بە شێوازی ئاینە کۆنەکە ئیسلامیان وەرگرتووە .

فارسە ئاگر پەرستەکان ئاینی ئیسلامیان تێکەڵی ئاینی (مەجووسی) خۆیان کردووە و ناویان ناوە (شیعە) .

ئاینە کۆنەکانی (بابلی و سۆمەریەکان) بوون بە موسوڵمان ئیسلامیان بە شێوازی (تەسەوف) وەرگرتووە .

سەیری عیباداتیان بکە هەر تەریقەیەك جیاوازە لەوی تر بەگوێرەی ئاینی پێش ئیسلام لەو ناوچەیەدا ئیسلامیان لەگەڵ تێکەڵ کردووە و کردوویانە بە تەریقەتێك .

ئەو کەسانەی شوێن (فەلسەفەی یۆنانی) کەوتوون ئاینی ئیسلامیان قبوڵ کردووە . بە شێوەی فەلسەفە و پرسیار و وەڵام , وە ناویان لێناوە (معتزلة) .

خاڵی گرنگ لێرە دایە ، ئەم فیرقانە نەیان توانی ڕای جیاواز دروستبکەن و قورئان بە ئاقارێکی تردا بەرن . چونکە قورئانەکە بە نوسراوی هەبوو ، سێ فیرقە دروست بووە کێشە نیە و نابێتە فەوتانی ئاینی ئیسلام .

چونکە لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەو سێ فیرقەیەدا ، خودای زانا چوار ئیمامی بەرامبەریان ڕاوەستاند بە گوێرەی ساڵی لەدایك بوونیان بە ساڵی کۆچی, واتا دوای کۆچی خۆشەویست (ﷺ) بۆ مەدینە , بەم شێوەیە بوو :
(ئیمام ابە حنیفە 80ی کۆچی) . (ئیمام مالك 93) ، (ئیمام شافعی 150) ، (ئیمام احمد 164) .
ئەم پیاوە بەڕێزانە هاتن ئاینی ئیسلامیان دارڕشت بەگوێرەی قورئان و حەدیسەکان . ئەم بەڕێزانە زۆر نزیك بوون لە زەمانی هاوەڵانەوە و بینیویانن و کوڕەکانیان بینیوە ،

کاتێك دەڵێن چوار مەزهەبەکە , مەبەستیان ئەو چوار پیاوە بەڕێزەیە . ئەمان هاتن ئەو ڕا و بۆچونە نوێیانەی ئەو سێ فیرقەیەیان پوچەڵ کردەوە . ئاینی ئیسلامیان دارڕشتەوە . کێشەی ڕای جیاوازیان بنەبڕ کرد لە ئاینی ئیسلامدا.
لە پاش مردنی ئەو چوار ئیمامە بە ماوەیەکی زۆر کەم, پەنجا ساڵێك ، جارێکی تر کێشە کەوتە ناو مەنهەجی ئیسلامەوە . ئەم ئیمامە بەڕێزانە هاتن حەدیسیان کۆ کردەوە .
ئەمەش ساڵی لە دایك بونیانە بە ساڵی کۆچی :
( بوخاری 194 ، مسلم 204 ، النسائي 215 ، ابو داود 202 ، الترمذي 209 ، ابن ماجة 209 ) ..

لە هەمان زەماندا (الطبري) بەڕەحمەت بێت, یەکەم تەفسیری قورئانی نووسی . لە دایك بوی ساڵی 224ی کۆچیە .

(سەلەفیی وەهابی لۆرانسی عەرەب) لەم بەشەی دووەم دا , فێڵی لێکردووین و ئاینی سەلەفی داناوە .
لەم زەمانەدا (شیعە و سۆفی و معتزلة) پاش ئەوەی ئەو چوار مەزهەبەی باسمان کرد ، بناغەی ئاینی ئیسلامیان دانا لە وڵاتێکی فرە شارستانی و بتپەرستی کۆنی عێراق دا . ئەو سێ فیرقەیە ...
بە شێوازی نوێ هاتن ئاینی ئیسلام بگۆڕن . ئەویش لە ڕێگای ، حەدیسەکانی خۆشەویستەوە (ﷺ) . چونکە زانیان دەرەقەتی قورئانە نووسراوەکە نایەن .

بۆیە لەم زەمانەدا ئیمامی (بوخاری و مسلم) بەرەنگاری ئەم هێرشە نوێیە بوونەوە . ئەم دوو پیاوە بەڕێزە دەبووایە 100٪ دڵنیا بوونایە لەو کەسانەی حەدیسەکانیان لێ بیستووە ، ئینجا نەقڵیان دەکرد .
ئەم چوار ئیمامە بەڕێزە ( النسائي ، ابو داود ، الترمذي ، ابن ماجة ) . بەهەمان شێوە حەدیسیان نووسیەوە .
بەڵام وەك (بوخاری و مسلم) پشکنینیان بۆ کەسەکان نەکردووە ، بەڵکو ئەو چوار پیاوە بەڕێزە ئەوەی بیستوویانە نەقڵیان کردووە لە کتێبەکانیان دا .

هەر لەم زەمانەشدا فیتنەی ئیمام ( احمد بن حنبل ) , سەری هەڵدا ئایا قورئان قسەی خودایە یان مەخلوقە ؟
لەم کاتەدا ئیمامی طبري ساڵی 224 لە دایك بووە . هەستا بە تەفسیر کردنی قورئان و یەکەم موفەسیرە .
کە سەلەفیزمی سعوودی لەم تەفسیرەشدا فێڵمان لێدەکەن .

چونکە ئیمامی طبری تەفسیری قورئانی نەکردووە . بەڵکو هەرچیەکی بیستووە لە مامۆستاکانی دەربارەی قورئان .
ئەم پیاوە بەڕێزە نەقڵی کردووە و لە کتێبێك دا کۆی کردووەتەوە و پێی دەڵێن: (تفسير الطبري) .

ئەم پیاوە بەڕێزە هەرچیەکی بیستووە نەقڵی کردووە ، ئیتر ئەو قسانە چەندی راستە و چۆن گەیشتوە بە طبری ؟
کەس نازانێت و خۆشی بەدواداچوونی نەکردووە بۆ ئەو ڕیوایەتانە .

پێویستە ئەوە بزانن کاتێك ئیسلام بڵاوب,وەوە . ئەو وڵاتانەی لەژێر دەسەڵاتی ڕۆم و فارس دا ب,ون خاوەنی هەزاران ئاینی بتپەرستی و فکری جیاجیا بوون . لێرەدا بالانس و هاوسەنگی ڕاگرتن زۆر گرنگە . چونکە ئاینێك و فکرێکی نوێ بڵاو بووەتەو .
لە بەرامبەردا ئاین و فکری هەزاران ساڵی باو و باپیرانی ناوچە جیاجیاکانیش هەیە لە دەرەوەی دوورگەی عەرەب .
پێشتر باسم کرد کە ئەو چوار ئیمامە بەڕێزە, کە چوار مەزهەبیان دامەزراندووە بۆ ئیسلامی مەزن .

خودای زانا بەم چوار ئیمامە بالانس و هاوسەنگی ئاینەکەی ڕاگرت . ئەگەر سەیری مێژووی لە دایك بوونیان بکەیت . زۆر نزیکن لە هاوەڵانەوە .
(ئیمامی عەلی) ساڵی **40**ی کۆچی شەهید کرا و کۆتا خەلیفە بوو . (ئیمامی حەنەفی) ساڵی **80**ی کۆچی لەدایك بووە.
ئەم چوار ئیمامە توانیویانە هاوسەنگی ئیمانداری رابگرن لە نێوان ئاینی ئیسلام و ئاینە کۆنەکانی ناوچەکەدا .

هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام دوای هاوەڵان ئەم چوار ئیمامە بەڕێزە بوون . چونکە کاری هاوەڵان گەیاندنی پەیامی ئیسلام بووە . فریای ئەوە نەکەوتون ئەم پەیامە بۆ خەڵکی بگوێزنەوە .
وانەیان بۆ دابنێن و قسەیان بۆ بکەن و تێیان بگەیەنن ئاینی ئیسلام چییە . ئەوەی ئەم کارەی کردووە ئەم چوار ئیمامە بەڕێزەن . کەواتا دەبێت ئێمە دینی ئیسلام لەم چوار ئیمامە وەرگرین .
(سەلەفیزمی وەهابیی لۆرانس العرب) . زۆر بە توندی دژی ئەم چوار ئیمامەیە ، کاتێك ئەوان دەڵێن : ئێمە سەلەفین و شوێن ئەم حەدیسە دەکەوین ..
( خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ، ثُمَّ يَجِيءُ أَقْوَامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ )

دەبێت بزانین شوێن ئەو حەدیسە کەوتوون ؟
چونکە بەو حەدیسە دەتوانین ئاینی سەلەفیزم پووچەڵ بکەینەوە ، هەروەها ئەم چوار ئیمامە ڕاستەوخۆ لەو دوو قەرنە دا ژیاون کە پێغەمبەر (ﷺ) ناوی هێناون . دەبێت ئەم پرسیارەیان لێبکەین :
بۆچی سەلەفی سعوودی دژایەتی ئەو چوار ئیمامە دەکات و دەڵێت مەزهەب درۆیە و بوونی نییە لە ئیسلامدا ؟
وەهابیەکانی شوێنکەوتەی لورانس العرب . بەخۆیان دەڵێن سەلەفی . کێشە لەوەدایە تا ئێستا نازانن سەلەف مانای چییە .. ئەو چوار ئیمامە سەرەتا و دەستپێکی سەلەفە بۆ ئاینی ئیسلام دوای پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان (عليهم السلام) .
بەچی پێوەرێك ئەوان دەڵێن : مەزهەب لە ئیسلام دا گرنگ نییە ؟

ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە بۆ ڕەچەڵەك و سەلەفی ئاینی ئیسلام لە 2019وە هەتا زەمانی ئەو چوار ئیمامە .
ئێمە کۆتا سەلەفین بۆ پێغەمبەر (ﷺ) .
ئەو چوار ئیمامەش یەکەم سەلەفن بۆ پێغەمبەر (ﷺ) . کەواتا ئەسڵی سەلەف و سەلەفی ئەو چوار ئیمامەن کە سەلەفیەکان دژایەتی دەکەن . ئەمە خاڵی یەکەمە بۆ ناساندنی سەلەفیزم کە درۆ دەکەن و دوورن لە ئاینی سەلەف .

جارێکی تر بگەڕێوە بۆ حەدیسەکە .. باسی سێ زەمان دەکات . یەکەمیان زەمانی خۆی و هاوەڵانە .
دووەم و سێیەم زەمانی ئەو چوار ئیمامە بەڕێزەن کە سەلەفیەکان دەڵێن: ئەو چوار ئیمامە چوار چەمەلەغی سەیارەن و بۆیاخ کراون . ئاینی ئیسلام لەسەر ئەو مەزهەبانە بنیات نەنراون و مەزهەب بیدعەیە .

جارێکی تر بگەڕێوە بۆ حەدیسەکە .. بناغەی دامەزراندنی ئاینی سەلەفیزم ئەو حەدیسەیە .
ئایا خۆیان باوەڕیان پێی هەیە و شوێن ئەو چوار ئیمامە کەوتون . یان گاڵتە بە مەزهەب دەکەن ؟
وەك ڕوون و ئاشکرایە و هەمووتان دەزانن چوار مەزهەبەکە لە دووەم و سێیەم زەمانی زێڕین دا دروست بووە .
سەلەفیزم باوەڕیان بە بەشی یەکەمی ئەو حەدیسە نیە .

ئێستا با بچین بۆ بەشی دووەمی حەدیسەکە :
( ... ثُمَّ يَجِيءُ أَقْوَامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ )
بڕۆن بۆ هەموو سایتە سەلەفیەکان , شیکار بۆ ئەم بەشە کراوە بەوەی خەڵکی شایەتی درۆ دەدەن .
منیش دەپرسم : چی پەیوەندی و پێکەوە بەستن هەیە لە نێوان (شایەتی درۆ) و (باشترین زەمان) دا ؟
باشترین سێ زەمان واتا: تەوحید و دینداری و سوڵحان بۆ خودا , بەگوێرەی قورئان و سونەت .

فەرموو کەسێکی ئاقڵ تێمان بگەینێت (سوێندی درۆ) چی کاریگەریی هەیە لەسەر گۆڕینی ئاین بەباش یان بەخراپ.
ڕوونتر دەڵێم : باشترین زەمان بە سوێندی درۆ دەگۆڕدرێت بە خراپترین زەمان ؟
ئێستا گەر هەریەکێکتان پرسیار لە خۆتان بکەن و ئەم پرسیارە لە خەڵکی بکەن هەتا ئادەم (علیە سلام) .

کاممان پێویستیمان بە سوێندی درۆ هەیە ؟
ئەوە سوێندی درۆشمان خوارد ئەم سوێندە چی کاریگەریی هەیە کە باشترین زەمان یان دین بگۆڕێت ؟
سەیری دەرس و پێگەی سەلەفیەکان بکەن ، هەر هەموویان ئەم بەشەی حەدیسەکە دەقرتێنن لەکاتی دەرس و قسەکردنیان دا ، گەر نەشی قرتێنن بە شایەتی درۆ شیکاری بۆ دەکەن .
منیش دەڵێم :

شایەتی و شایەتی درۆ , لەدوور و لەنزیك پەیوەندی نییە بەم حەدیسەوە ، چونکە پەیامبەر خاوەن پەیامە (ﷺ) ،
ئەم حەدیسە موعجیزەیە و باسی دوای خۆی دەكات . سەرەتای حەدیسەكە باسی سێ زەمانی زێڕین دەكات .
دەبێت نیوەی دووەمی حەدیسەكە باسی نەمان و لاوازبوونی ئەو زەمانە زێڕینە بكات . نەك شایەتی درۆ .
ئەگەر نیوەی دووەمی حەدیسەكە پەیوەندیی نەبێت بە نیوەی پێشەكیەوە , واتا ئەوە قسەی پێشەوا و پەیامبەرێك نیە
باسی موعجیزەیەك لە داهاتوو دا بكات .

كەوایە عیبرەتەكە لە نیوەی دووەم دایە , بۆ ئەوەی ئەوانەی دوای ئەو سێ زەمەنە بتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئەو سێ
زەمەنە زێڕینە .

نیوەی دووەم دەفەرموویت :

( ... ثُمَّ يَجِيءُ أَقْوَامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ ) .

لەم بەشە باسی ( شهادة ) كراوە واتا شایەتیدان .
هەموو مرۆڤێك لە جیهاندا پێش ئیسلام و دیندار و بێدین . هەتا دەمرێت كاری بە شایەتی نییە .
لەوانەیە ڕووداوێك یان معاملەیەك هەبێت كەسێك ئاگاداری بێت . گەر كێشە هەبوو بانگ دەكرێت بۆ شایەتی .
ئەم شایەتیدانانەش لە ژیانی مرۆڤدا زۆر كەمن .
شایەتی دادگا و مەحكەمەش دەگمەنن ، زۆربەی خەڵك هەتا دەمرێت كاری بە دادگا نیە بۆ شایەتی .
كەواتا شایەتی ڕاست و درۆ پەیوەندیان نیە بە تێكچوونی سێ زەمەنی زێڕینەوە . یان بەڵگە و نیشانە بێت بۆ ڕاست
و دروستی كەسێك یان كۆمەڵێك وەك ئەو سێ زەمەنە زێڕینە بێت .
پێغەمبەریش (ﷺ) "لا ینطق عن الهوى" . خۆشی دەفەرموویت: ( لا فخر اوتیت جوامع الكلم ) .

هەر تاكێك لە مرۆڤ شایەتی لە ژیانیدا هەیە لەو دەقەیەی لە دایك دەبین هەتا دەمرین و پاش مردنیش هەیە .
كاتێك مناڵ لە دایك دەبێت كەس و كار شایتی دەدەن دەڵێن لە فلان دەچێت . دایكەكە هەموو جوولە و
كردارەكانی دەشوبهێنێت بە كەسێك یان باڵندەیەك یان.. هتد ... وە كاتێك گەورە دەبێت, بە گوێرەی كارەكانی
وەسف دەكرێت باشە ، خراپە ، درۆزنە ، هەزەلییە ، دزە ، قۆڵبڕە.. هتد ...
ئەمانە هەمووی وەسفی خەڵكە یان دایكە بۆ كۆرپەكەی . ئەم وەسفانەش هۆكاری بینینی خەڵكە بۆ كردارەكەی .
بەگوێرەی كردارەكەی شایەتیی بۆ دەدەن كێیە و چییە و چۆنە .
كاتێكیش كەسێك بیەوێت خۆی بناسێنێت یان كێشەی هەبێت . دەڵێت : بڕۆ ناو خەڵك بزانە من كێم ؟
واتا من و تۆ و هەموو كەس بە شایەتی خەڵكی دەناسرێین .
ئەم شایەتیەش بۆ تاك نییە . بەڵكو بۆ مەنهەج و فكر و ئاین و هەموو ورد و درشتێكی ژیانە .
فلان زیرەكە ئیشكەرە بەدینە چەنەبازە.. هتد ... ڕۆژی قیامەتیش شایەتی خۆت و خەڵكی سەنگی مەحەكە .

پاشان وشەی ( یمین ) هاتووە :

( ثُمَّ يَجِيءُ أَقْوَامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ )

(یمین) واتا ڕاست ، مانای ئەسڵی واتا هێز . چونکە هەمو ڕاست و ڕاستیەك هێزە بۆ کەسەکە یان فکرەکە یان شمەکەکە .

شتی صینی نا ڕاستە و عادیە هەموو کەس ئەو شایەتیە دەدەن . دەستی ڕاست هێزی مرۆڤە .

سەیری قورئان بکەن (یمین) هێزە و دەسەڵاتە :

1- هێزی تاك لە ڕۆژی قیامەت لە سجلی اعمالی دایە :

( فَمَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ ) ..

2- کاتێك مووسا (علیە سلام) ڕووبەڕووی ساحیرەکان بووەوە هێزەکە لە لای ڕاستیەوە بوو :

( وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا ) ..

3- هێز و توانای پێغەمبەر (ﷺ) لە کتێبی قورئاندا بوو :

( وَمَا كُنْتَ تَتْلُو مِنْ قَبْلِهِ مِنْ كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ ) ..

4- (ملك اليمين) بە هێزی بازوو دەگیرێت لە مەیدانی شەڕ دا ..

5- ابراهیم (علیە سلام) بە هێزی بازوو بتەکانی شکاند و هێزی خوداکانی نیشان خەڵکیدا کە هیچ نینە :

(فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًا بِالْيَمِينِ ) ..

6- ئەوانەی شوێن زاڵمەکان کەوتوون لە دنیادا زۆر بەهێز بوون ، ڕۆژی قیامەت بێهێزن .

شوێن کەوتووانیان بە زاڵمەکان دەڵێن : "ئەوە هێزی ئێوە بوو ئێمەی بەم حاڵە گەیاند".. :

( قَالُوا إِنَّكُمْ كُنْتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ الْيَمِينِ ) ..

پاشان وشەی ( یجئ ) هاتووە :

( ثُمَّ يَجِيءُ أَقْوَامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ )

ئەسڵەکەی لە ( جاء ) هاتووە . واتا هاتن , وشەی ( اتی ) هەر بە مانای هاتن دێت .

جیاوازیان ئەوەیە **جاء** بۆ کاتی زەحمەت و ناخۆش و نەهامەتییە .

**( اتی )** بۆ ئەو کاتانەیە هێورترە و زەحمەت و ناخۆشیی تێدا نیە .

خۆتان لە قورئان بگەڕێن ئایاتی (**جاء** و **اتی**) زۆرە .

لە قورئاندا هەر هەمو ( جاء ) بە ڕابردوو هاتوە . بە هیچ کام لە دۆخەکانی تر نەهاتووە .

بەڵام لەم حەدیسە دا بە داهاتوو هاتووە . واتا خەڵکانێك دێن ، پێویست ناکات بناسرێن , خەڵکی شایەتی دەدەن بۆ هێز و تواناکانیان .

پاشان دەفەرموویێت :

( وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ ) ..

هەروەها هێز و تواناکانی شایەتی بۆ دەدەن . دیقەت بدەن وەسفەکە زۆر دەقیقە و دوو لایەنە :

( شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ ) ..

خەڵکی شایەتی بۆ دەدەن کەسێکی خاوەن ئاین و بە تەقوایە و بۆ خوا سوڵحاوە . چونکە لێیان بینیوە و دەزانن تواناکان چەندە ..

( تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ ) ..

ئەگەر خەڵکیش نەیناسن یان پشتی تێ بکەن ..

( وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ ) ..

هێز و تواناکانی شایەتی بۆ دەدەن .

کۆتایی ئەم حەدیسە کە سلفیزم دەیبڕن یان بە شایەتیی درۆ شیکاریی دەکەن . هەر خودی حەدیسەکە بە درۆیان دەخاتەوە .

ئەگەر بە مانای شایەتی درۆ بێت ..

دەپرسین : ئەی ( وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ ) مانای چیە و بۆچی هەمان دوو وشە پێچەوانە کراوەتەوە ؟

ئەم حەدیسە کە سەلەفیزم کردوویانە بە بەڵگە بۆ دینەکەیان . دینەکەیان پووچەڵ دەکاتەوە . چونکە ئەوان باوەڕیان بەو سێ سەردەمە زێڕینە نییە .

بەڵگەشم: دوو سەردەمیان لە حەدیسەکەدا باسکراوە کە چوار مەزهەبەکەیە . سەلەفیزم گاڵتەی پێدەکەن .
ئەمەش بەڵگەیە باوەڕیان بە سەردەمی یەکەمیش نییە .

ئەگینا چۆن ئەو چوار مەزهەبە ڕەتدەکەنەوە کە خۆشەویست (ﷺ) شوبهاندوویەتی بە زەمانی خۆی ؟
پاشان نیوەی دووەمی حەدیسەکەش دەقرتێنن ..

خالی گرینگ ئەمەیە :
بە شوێن کەوتووانیان دەڵێن: مەچنە ناو دژە ئیسلام . مەچنە ناو حیزب . مەچنە ناو مزگەوتێك کە سەلەفی نەبن, دەبێت ئاستی سەلەفیەکەشیان وەك مامۆستاکەی تۆ بێت . دەبێت هەمو چاك و خراپ و هەڵسوکەوتتان لە (شامان)[1]ەکەتانەوە بێت و ئیمامی مزگەوتەکانی تریش هاوڕێ و هاوڕای شامانەکەی تۆ بێت .

ئەمەیە مانای :
(شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ ) ..
شایەتیدانی شامانەکانە بۆ هێز و توانای شامانێکی تر ..
( وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ ) ..
هێزی شامانی دووەمیش شایەتی دەدات بۆ شامانی یەکەم ..

سەیری سەلەفیزم بکەن دەڵێی (بلوتوث و وای فاین) . دایم سیگنالیان هەیە بۆ ئاگادارکردنەوە و ئابڕوو بردنی نەیاران و دەنگ تەسجیل کردنیان .
بۆیە ئەم بەشەی دووەمی حەدیسەکە دەبڕن و بە( شایەتی درۆ) شیکاری دەکەن .
کاتێك سەلەفیەکان بچنە ناو خەڵکەوە ..
(شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ ) ..

شایەتی و دیدی خەڵك بۆ سەلەفیزم , هێزی فکرەکەیان دەردەخات . کابرای سەلەفی کە دەگەڕێتەوە بۆ لای شامانەکەی ..
( وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ ) .. شامان ناتوانێت وەڵامی بداتەوە هێز و دەسەڵاتی نامێنێت .

---

شامان[1] :

جاران پیاوە ئاینییەکانیان لە لای مەغۆلەکان پێیان دەگوتن شامان . لای هیندییە سورەکان پێیان دەگوتن شایان ، شایانیش هەر خۆی قەبیلەیە وەك چۆن لای جووەکان پیاوە ئاینییەکان لە قەبیلەی لاوییەکانن .

موسوڵمانیش هەیە بەهەمان شێوە ئیسلامەتی دەکەن . مامۆستاکانیان بون بە شایان و شامانەکانیان هەرچییەك ئەوان نەیان گوت بێت وەری ناگرن و بە دینی نازانن .

پاش ئەم نموونەیە ئێستا لەو حەدیسە تێگەیشتین . پێغەمبەر (ﷺ) پێمان دەفەرموێت : هەتا زەمانی (احمد بن حنبل) زەمانی زێڕینە . پاش ئەوان ئەم ئاینە وەك خۆی نامێنێت ، خودای خاوەن دەسەڵات خەڵکانێك دێنێت ئەم ئاینە بەڕێوە دەبەن . خەڵکی شایەتیان بۆ دەدات و توانای خۆشیان شاهیدن بۆیان .

کاتێك دەلێن: مێژووی ئیسلام و خەلیفەکان شەڕ و ناکۆکییە .

مەبەست لەو حەدیسەیە ، ئاینی ئیسلام هاتووەتە ناو قەومی جیاجیای بتپەرستی خاوەن هەزاران ساڵ لە بتپەرستی . ویستوویانە ئیسلام لەناو بەرن خودا کەسانی بۆ خوا سوڵحاوی ناردووە, بۆ ئەوەی زەمەن بگێڕنەوە بۆ زەمەنی زێڕین. ئەوەتا ئێمە و هەموو دنیا شایەتیان بۆ دەدەین کە هەوڵیانداوە .

کاتێك باسی ڕای جیاواز دەکرێت لە ئیسلامدا . ئەم ڕا جیاوازە شەڕ و فیتنەی زۆری لێکەوتوەتەوە . مناقشە و مێزگرد نەبووە . بەرامبەر ویستویەتی بتپەرستی بگەڕێتەوە و خوداش نەیهێشتووە دینەکەی لەناو بەرن .

باشترین نموونەش : دوو زەمەنی زێڕینە لە یەکەم زەمەن کە دەرکەوت (ئیمام ابو حنیفە) بوو .
هێندە شارەزا بوو , کە فقە و شەرعی خودای دامەزراند بەبێ ئەوەی پشت بە حەدیس ببەستێت .
چونکە شارەزاترین کەس بوە لە زمانی عەرەبیدا دوای خۆشەویست (ﷺ) . وەحی خوێندووەتەوە زانیویەتی شەرعی خودا بدۆزێتەوە .
ئەمەش بەڵگەیە بۆ بەهێزی ئەم ئاینە . چونکە (ابو حنیفە) لە (کوفە) لە دایك بووە لەناو جەرگەی فیتنەی (شیعە و سۆفی و معتزلە) دا . دەرگای فیتنەی بەوە داخستووە نەیهێشتوە بەناوی حەدیسەوە تەئویلات بۆ قورئان بکرێت , بەڵکو بە دەقی قورئانەکە شەرح و شەرعی ئیسلامی داناوە .

فیتنەکان زۆر بوون ، پاش ئەوەی (ابو حنیفە) بەرەنگاریان بووەوە . بەرامبەر هاتن لە ڕێگای حەدیسەکانەوە کەلێن بخەنە ئاینی نوێوە . بەڵام خودای خاوەن دەسەڵات ئیمامی (بوخاری و موسلیمی) کرد بە هۆکار بۆ نووسینەوەی حەدیسەکان .
هەر لە هەمان سەردەم دا ئەم ئیمامە بەڕێزانە پەیدا بوون و حەدیسیان نووسییەوە :
( النسائی و ابو داود و ترمذی و ابن ماجە ) .. کە دوای دەگەڕێمەوە بۆ باسی ئەم چوار ئیمامە بەڕێزە .

لەو زەمانەدا فیتنەکان زۆر بوون ئەم جارە قورئانیشیان تێوە گلاند . پاڵەوانی ئەم جارەیان (ئیمام احمد بن حنبل) و (ئیمامی الطبري) بوون .
(معتزلە) دەیانگوت : قورئان کەلامی خودایە یان مەخلوقە ؟ شیکاری سەیریان دەکرد بۆ قورئان و تەفسیری سەیرتریان دەکرد بۆ پشت ڕاست کردنەوەی قسەکانیان .
(طبری) لە دایك بووی ساڵی 224ی کۆچییە . بە ڕەحمەت بێت هەستا بەوەی هەرچی بیستبوو لەسەر قورئان کۆی کردەوە لە کتێبێکدا و ناوینا (تفسیر الطبري) . بۆ ئەوەی ببێت بە بەڵگە بۆ ئەو زەمانە ، کە قورئان بەگوێرەی تێگەیشتنی خەڵکانی پێش خۆیان شیکاری کراوە .

لە بەرامبەریشدا ئێوەی (معتزلە) وەرن شیکاری خۆتان بهێنن , بزانین ئێوە لە کێوە وەرتان گرتووە ؟
بەم شێوەیە فیتنە کۆتایی پێهات و (معتزلە) بەڵگەیان پێ نەبوو . وە (ئیمامی طبری)شیان کوشت و بەربارانیان کرد لەناو ماڵەکەی خۆیدا .

باسی سەرەکی ئێمە ڕای جیاوازە لە ئیسلام دا و چۆن سەلەفیزم یاری لەسەر ئەو پەتە دەکەن ؟
لە حەدیسەکان دەست پێدەکەین ...
ئەو حەدیسانەی (بوخاری و مسلم) هەرهەمووی ڕاستن ، چونکە خودی خۆیان بەدواداچوونیان کردووە بە دوای کەسەکاندا و لێیان بیستوون , ئینجا نووسیویانە .
بەڵام چوار ئیماماکەی تر .. ( النسائی و ابو داود و ترمذی و ابن ماجه ) ..
ئەمان بەس نەقلیان کردووە ، هەرچیەکیان بیستووە نەقلیان کردووە . وەك (بخاری و مسلم) لە بێژینگیان نەداوە . ئاستی ڕاستی و دروستیی نەزانراوە .
سەلەفیزم هاتووە لێرەدا بناغەی دینەکەی داناوە و فێڵی کردووە .

هەموومان (شێخ البانی) دەناسین بەڕەحمەت بێت . ئەم پیاوە بەڕێزە پاش 1200 ساڵ هاتووە ئەم حەدیسانەی لە بێژینگ داوە . لەسەر بناغەی (سەنەد) ئەم کارەی کردووە ... سەنەد: واتا ئەو کەسانەی ئەو حەدیسەیان گێڕاوەتەوە.

بۆ نموونە : ( احمد لەزاری محمود گێڕایەوە باوکی پێیگوتووە سامانی برادەرم عەزیزی بینیوە و بردویەتی بۆ لای شەماڵی عەبە ڕەش... ) .
احمد و محمود و باوکی محمود و سامان و عەزیز, سەنەدن . واتا پاڵپشت و شایەتن بۆ ئەوەی عەزیز شەماڵی بینیو.

من خۆم وەك (سەردار کەریم) .. هیچ حەدیسێکی (البانی) وەرناگرم ، بۆ هیچ بابەتێکیشم وەك بەڵگە بەکارم نەهێناوە بۆ وەڵامدانەوەی دژە ئیسلام .
چونکە :
زۆرینەی هەرە زۆری ئەو حەدیسانەی دەڵێت (صحیحە) لە قسەی مرۆڤی ئاسای ناچێت . چۆن وەری بگرم کە قسەی پەیامبەرن (ﷺ) ؟
کێشەی (البانی) لێرەدایە ..
گرنگیی نەداوە بە ناوەڕۆك و مانای حەدیسەکە ، گرنگیی داوە بە کەسەکان کە ناویان هاتووە .
ئەمەش گەورەترین کێشەیە !
چونکە ئەلبانی کەسەکان ناناسێت , چۆن پاش 1200 ساڵ دێت قسەکانیان تصحیح دەکات ؟
( النسائي و ابو داود و ترمذی و ابن ماجه ) خۆیان حەدیسەکانیان نووسیوە . بۆچی ئەوانیش وەك (مسلم و بوخاری) شوێن سەنەد واتا کەسەکان نەکەوتوون, تا بزانن ڕاست دەکات یان درۆزنە ؟, ماوە یان مردووە ؟

لەوەش گرینگتر ..

بۆچی لە ماوەی 1200 ساڵ دا کەس ئەم کارەی (البانی) نەکرد ؟

سەلەفیزمی سعودی هاتوون و (شێخ ئەلبانی)ان ئیستیغلال کردووە, ئەم کارانەیان بۆ کردووە بە کتێب. وە تەشجیعی بانگخواز و مینبەرەکانیان کردووە کە حەدیسەکانی ئەلبانی وەربگرن و بڵاوی بکەنەوە .

بەم شێوەیە.. گورزی گەورەیان لە ئیسلام داوە , برۆ بۆ سایتی فەتوای سعودی . هەموو دینی ئیسلامیان لە ئەلبانی دا کۆکردووەتەوە . هەموو فەتواکانی حەرام و حەڵاڵیان سەرچاوەکەی ( صحه الالباني )یە .

ئێستا بگەڕێوە بۆ حەدیسی سێ زەمەنە ئاڵتونیەکە ..

سەلەفیزم گاڵتە بە چوار مەزهەبەکە دەکات , کە زەحمەتی و شەقیان خواردووە بۆ ئیسلام . بەڵام پاش 1200 ساڵ لە سێ زەمەنی ئاڵتونی , ئاین و حەلال و حەرام لە (صحه الباني) وەردەگرێت .

پرسیاری سەرەکی ئەمەیە :

کوا ئەو سەلەف و پێشینەیەی ئەمان شوێنی کەتوون ؟

خۆتان حوکم بدەن لەم نێوانە دا ..

مەزهەبەکان سەرەتای ئیسلامە و دوو زەمانی زێڕینە و سەرەتای سەلەفە . سەلەفی گاڵتەی پێدەکات ..

وە (ئەلبانی) کۆتا سەلەفە زانا و موحەدیسە و عەلامەیە .

جا کاتێك دەڵێن : حەدیسەکانی ئیسلام درۆیە . مەبەستی خەڵك لە (بخاری و مسلم) نیە !

بەڵکو لە تەسحیحی ئەلبانیە پاش 1200 ساڵ .

زۆربەێ زۆرتان لێم تێناگەن ، چونکە کارتان نەکردووە لە بواری دژە ئیسلام و نەگەڕاون بەدوای سەرچاوەدا .

چۆن ئەم ئیمام ئەلبانیە حەدیسی تصحیح کردووە کە قسەی مرۆڤی ئاسای نییە و دوورە لە ڕاستیەوە ..

وە بەڵگەی ئیمام ئەلبانی بۆ ڕاستی ئەو قسە منداڵانەیە یان خورافاتە , ئەوەیە کە فلاّن و فلاّن لەو زەمەنەدا ژیاون .

یەکێکی تر لە یارییەکان کە سەلەفیزم یاری لەسەر دەکات تەفسیرەکانی قورئانە .
هەرهەموومان بیستوومانە لە مەلا و بانگخوازەکانمان . شیکاری و تەفسیر بۆ هەر ئایەتێك ڕا و بۆچوونی زۆری لەسەرە و هەموو حوکمێکی شەرعیش ڕا و بۆچوونی زۆری لەسەرە . بەڵگەشیان تەفسیری موفەسیرەکانە .

یەکەم موفەسیر (الطبری) بووە ساڵی 224ی کۆچی لەدایك بووە . ئەم پیاوە بەڕێزە لە زەمانی فیتنەی ( احمدی کوڕی حەنبەل)دا ژیاوە و تەفسیری کردووە .
ئەم بەڕێزە دانەنیشتووە شیکاری و تەفسیری قورئان بکات . بەڵکو لەو زەمانی فیتنەیەدا دەیانگوت قورئان قسەی خودا نیە و مەخلووقە .

ئەم بەڕێزە هاتووە ئەوەی زانیویەتی و بیستوویەتی لە مامۆستا و شێخەکانیەوە لەسەر هەموو قورئان نەقڵی کردووە .
ئێستا بڕۆن بۆ (تەفسیری طبري)... هەر ئایەتێك هەڵدەبژێرن هەڵبژێرن . نووسراوە ئەم ئایەتە :
" قال أبو جعفر : اختلف أهل التأويل.. "
(ابو جعفر) لەقەبی طەبەریە بەڕەحمەت بێت ، واتا طبری دەڵێت : زۆر جار رای خۆی دەڵێت ئینجا دێتە سەر رایەکانی تر . بەلام زۆرترین جار ڕاکانی تر نەقل دەکات ( اختلف اهل التأويل ) .

واتا ئەوانەی شیکاری ئەم ئایەتەیان گێڕاوەتەوە جیاوازی هەبووە لە گێڕانەوەیان بۆ ئەم ئایەتە .
ئەم پیاوە بەڕێزە لەو زەمانی فیتنەیەدا هاتووە ئەم کارەی کردووە لە سەرەتای بلاوبوونەوەی ئیسلامدا بووە کە ئیسلام تەمەنی 200 ساڵ بووە .
بەم شێوەیە تەئویلی قورئانی گەڕاندووەتەوە بۆ ئەو کەسانەی پێش خۆی چییان گوتووە و چۆن شیکاریان بۆ قورئان کردووە بەم شێوەیە فیتنەکە هێور بووەتەوە .

مەبەستی من لە باسکردنی طەبری ئەوەیە :
کاتێك دژە ئیسلام دەڵێت : قورئانەکەتان پڕە لە ڕای جیاواز و تەفسیر دەکات بە بەڵگە .
ئەو بەڵگانەی دژە ئیسلام پووچەڵن ، چونکە طەبەری تەفسیری نەکردووە ، بەڵکو ڕای خەڵکی پێش خۆی نەقڵ کردووە لە زەمانی فیتنە دا .

سەلەفیزم هاتوون ئەم ڕا جیاوازەیان کردووە بە بەڵگە بۆ کار و باری ئاینی و فەتواکانیان . هەر یاسایەکیان بوێت بە ناوی ئاینی ئیسلامەوە دەیشەرعێنن لە دوو ڕێگاوە :

**یەکەمیان :** حەدیسەکان , و یاری بە حەدیسەکان دەکەن وەك پێشتر باسم کرد .

**دووەمیان :** تەفسیری قورئان و دەڵێن: ئەوەتا (شیخ المفسرین الطبري) وا دەڵێت .
لە کاتێکدا طبری خۆی لە سەرەتای تەفسیرەکەدا دەڵێت: ( اختلف اهل التأويل ) , لێرەدا سەلەفی و دژە ئیسلام هەردووکیان ڕووی یەك دراون .

سەیری ڕەخنەی دژە ئیسلام بکەن لە تەفسیرەکان دەری دەهێنن, بۆ نموونە شیکاری ئایەتێك 25 ڕای لەسەرە ، دژە ئیسلام دێت ئەو ڕایەیان هەڵدەبژێرێت کە خۆی دەیەوێت و دەیکات بە بەڵگە و باز بەسەر 24 دانەکەی تردا دەدات .

سەلەفیش بۆ شەرعاندنی فەتواکانیان ئەو ڕایە هەڵدەبژێرێت کە خۆی دەیەوێت باز بەسەر ئەوانی تردا دەدات .

ئێستا ئێوە دەپرسن :
کەواتا ئێمە چی بکەین و چۆن بزانین کام ڕایە ڕاستە ؟
منیش دەڵێم : دەبێت خۆت عەربی باش بزانیت بۆ ئەوەی لە دەقە ئەسڵیەکەی قورئان تێبگەیت .
چونکە پەیامبەران کە هاتوون زەمانی ئەوان (مفسر) نەبووە . پەیامبەرەکە قسەی کردووە و خەڵکەکە تێگەیشتوون .

تەنانەت لە دیبەیتی نێوان موسوڵمان و جوو یان گاور . نابێت هیچ کام لەو دووانە تەفسیر بکەن بە بەڵگە .

وەك شێخ دیدات دەڵێت : "" هیچمان ناگەڕێینەوە بۆ تەفسیری خۆمان یان تەفسیری تۆ بکەم بە بەڵگە .
بەڵکو دەقەکە چۆن دابەزیوە دەیخوێنینەوە و خەڵکی چۆن تێگەیشتووە کۆن و ئێستا لەسەر ئەو تێگەیشتنە قسە دەکەین . ""

پاش زانینی زمانی عەرەبی, تێگەیشتن لە (طەبەری) زۆر ئاسانە لەو ڕا جیاوازانەی کە دایناوە . تۆ دەتوانیت بڕیار بدەیت چەند دانەیان لەگەڵ مانای ئەسڵی ئایەتەکان هاوڕایە و شان بە شانی دەڕوات .
ئەوکات دەزانیت ڕاکانی تر نەیان پێکاوە .

بەم شێوەیە تۆ دوو قازانجی زۆر گەورە دەکەیت :

**یەکەم :** لە دینەکەت تێدەگەیت دەتوانیت وەڵامی دژە ئیسلام بدەیتەوە .
**دووەم :** هەموو مەلا و بانگخوازەکان دەناسیت .

چونکە :

هەر ئایەتێك لە قورئان بهێنین و بیدەین بە چەند مەلا و بانگخوازێك . هەریەکە و تەفسیرێکی بۆ دەکات .
ئەمەش بووەتە هۆکاری ئەوەی سەر لەخەڵکی بشێوێت و نەزانن ئاینی ڕاست لای کێیە .

هەتا تۆ نەزان بیت و خۆت ماندوو نەکەیت و شوێن دینەکەت نەکەویت . دڵنیابە ناتوانیت مناقشەی دین بکەیت لەگەڵ دیندار و بێدین . هەموو بانگخوازێك دەتوانێت یاریت پێبکات و دینت پێبفرۆشێت .

کەواتا کلیلی زانینی ئاین لای خۆتە نەك شوێنکەوتەی مامۆستایەك یان ڕەوتێك یان بانگخوازێك بیت .
کەی توانیت نەبیت بە شوێنکەوتە و کۆیلە, ئەو کات موسوڵمانی عەیارە 24یت .

بۆچی من باسی (حەدیسەکان) و (تەفسیرەکان)م کرد و پەیوەندی چییە بە شەڕی ئێران و ئەمریکاوە ؟
ئامانجی سەرەکیی ئەم شەڕە , شەڕی مەزهەبییە لە نێوان شیعە و سونە .
ئەگەر تۆ نەشارەزا بیت لە دینەکەت بە هەموو شێوەیەك ئیستیغلالت دەکەن و دەکەویتە ناو شەڕە سەگەکانەوە لەوانەشە ئیستیفزاز بکرێیت و بکوژرێیت .

بۆ ئەوەی تێنەکەویت دەبێت سەرەتا ئاینی (لۆرانس العرب) بناسیت . بەڵگەکانی ئاینی لۆرانس زۆر بە ئاسانی پووچەڵ دەکرێتەوە ئەگەر تۆ بزانیت داوای بەڵگەیان لێبکەیت .
واتا.. کاتێك پۆست دەکەن لەسەر جیهاد یان حەلاڵی و حەرامی , داوای بەڵگەیان لێ بکە :
ئەوانیش بە لێشاو بەڵگەی کۆپی و پەیستیان لایە و ئامادەیەو بۆت دادەنێن ، هەر هەمووی ئایەت و حەدیسە .
تۆ داوایان لێبکە :
کام لەو چوار ئیمام و مەزهەبەی ئیسلام ئەمەی پەسەند کردووە یان ئەم قسەیەی تۆ پشت ڕاست دەکاتەوە ؟

ئەویش بەڵگەت بۆ دادەنێت ، لێرەدا وریابە و سەیری بەڵگەکەی بکە , قسەی شوێنکەوتوویەکی یەکێك لەو ئیمامانەیە دوای سەدان ساڵ .
بڵێ ئەو بەڵگەیە ناڵێم .. بەڵکو بەڵگەم بدەرێ لە خودی کتێبی ئیمام ابو حنیفە یان شافعی یان دوانەکەی تر , کە خۆی وای گوتبێت .
فبهت الذي كفر ... کابرای لۆرانسی ناتوانێت بەڵگەت بۆ بهێنێت .
بەم شێوەیە تۆ دەگەڕێیتەوە بۆ ئەو زەمانە زێڕینەی کە خۆشەویست (ﷺ) باسی کردووە , موسوڵمانی عەیارە 24 نەك موسوڵمانی ئاینی لۆرانس .

ئەگەر تۆ شارەزاش نەبیت لە دین ، یان کاتت نەبێت دیراسە بکەیت لە ئاین . خۆ دەتوانیت داوای بەڵگە بکەیت , خۆ دەتوانیت کە بەڵگەکەی دانا لە گوگڵ ناوی کتێبەکە بنووسیت و لە (مكتبة شاملة) بەش و لاپەڕەکەی بدۆزیتەوە وە بزانیت کابرای لۆرانسی ڕاست دەکات یان نا ؟

بەم شێوەیە خۆت دەپارێزیت لە فیتنەکان و کەس ناتوانێت بە ناوی خوداوە هەڵت بخەڵەتێنێت .
ئێستا زانیت بۆچی باسی حەدیسەکان و تەفسیرەکانم کردووە پێشتر ؟
من هێشتا لە بابەت دەرنەچووم و ڕادە و ئاستی شارەزای تۆ لە دین بڕیار دەدەن دەکەویتە فیتنەوە یان نا ؟..
شەڕت پێدەکەن و دەتکوژن بە ناوی جیهادەوە یان نا ؟..
خۆت بناسە .. تۆ کێیت ؟..
بڕۆ خۆت بدۆزەرەوە , ئەو کات بڵێ : موسوڵمانم ,کە خۆتت دۆزیەوە لە ساحەی یاریەکەی ئەم شەڕە بە دووریت .

ئایەتی ( لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ ) .

بێدین دەڵێت : ئەو ئایەتە (نەسخ) کراوەتەوە و بەڵگەشیان تەفسیری (ابن کثیره) .
کە دەڵێت : " وقد ذهب طائفة كثيرة من العلماء أن هذه محمولة على أهل الكتاب ومن دخل في دينهم قبل النسخ والتبديل إذا بذلوا الجزية . "
سەرنج بدەن لێرەدا دوو ڕا هەیە, یەکەمیان دەڵێت: زۆرینەی زانایان دەڵێن باسی ئەو کەسانە دەکات لە(اهل الکتاب) پێش ئەوەی ئاینەکەیان بگۆڕن چوونەتە ناو دینەکانیانەوە .
" وقال آخرون : بل هي منسوخة بآية القتال وأنه يجب أن يدعى جميع الأمم إلى الدخول في الدين الحنيف دين الإسلام ، فإن أبى أحد منهم الدخول فيه ولم ينقد له أو يبذل الجزية ، قوتل حتى يقتل . "
خەڵکانی تریش دەڵێن ئەم ئایەتە نەسخ کراوە بە ئایەتی ( قتال ) .

فەرموون ئەمەش لینکی تەفسیری (ابن کثیر) :

http://quran.ksu.edu.sa/tafseer/katheer/sura2-aya256.html?fbclid=IwAR3svEG3wq6ov6yWqUc5SdeJl1AijdwqBbkNTbQuJ7eh3TsDZ2iuIuskmhk

باسی ئەم ئایەتەم بۆیە کرد ، بۆ ئەوەی شارەزابن لە تەفسیرەکانتان و دژە ئیسلام یاریتان پێنەکات .
وەك لە سەرەوە بینیتان (ابن کثیر) دەڵێت : ( و قال اخرون ) خەڵکانی تر وایان گوت . لێرەدا دەپرسم : ئەو خەڵکانە کێن وایان وت ؟ ئەگەر ناوەکانیان دیاری نەکرا بێت و لە صەحابەکان نەبن . ئەوە قسەیان لێ وەرناگیرێت و وتی خەڵکە و موفەسیر نەقڵی کردووە .
با بچین بۆ تەفسیری (طبري) . 21 ڕای بۆ نەقڵ کردووین لە حەدیسی ژمارە 5812 هەتا 5833 . کە هیچ کامیان باسی نەسخی نەکردووە .
تەفسیری (قرطبي) دەڵێت: شەش بۆچوون هەیە بۆ ئەو ئایەتە . یەکەمیان دەڵێت: "مەنسوخە" . وە دووەمیان دەڵێت: "مەنسوخ نییە" . چوارەکەی تری باسی نەسخ ناکات .

ئەوەی من دەمەوێت پێتان ڕابگەیەنم ئەمەیە : بەڵگەکان بۆ نەسخی ئایەتەکە پێدانی (جزية)یە .
پرسیاری سەرەکیش ئەمەیە : (جزية) کەی فەرز کرا ؟

زەمانی پەیامبەر (ﷺ) , جزیە نەدراوە و بوونی نەبووە . چونکە لە دوورگەی عەرب دا ( اهل الکتاب)ی لێ نەبووە . جووەکان دەرکران بۆ دەرەوەی دوورگەی عەرب . کاتێك جزیە داواکراوە کە ئاینی ئیسلام بڵاو بووەوە لە زەمانی (عومەری کوڕی خەطاب) دا .

ئەم وتی وتیەی فلان و فیسار کە موفەسیرەکان نەقڵیان کردووە . بە دین وەرناگیرێت چونکە زەمانی وەحی و هەتا زەمانی ئیمامی عومەریش (جزية) بوونی نەبووە . کەواتا ئەو ئایەتە نەسخ نەکراوە .

هیوادارم ئێوەش کاتێك گومانێك یان ڕەخنەیەك یان چەواشەکارییەك دەبینن لە دژە اسلامەوە .. بە مەنهەجی و بەوردی سەیری بابەتەکان بکەن ، نەك هەر شتێك نووسرا بێت لە تەفسیرەکان وەری بگرن . چونکە ئەو موفەسیرە بەڕێزانە بە تایبەت (ابن کثیر و قرطبي) . لە زۆربەی بابەتەکاندا کۆپی و پەیستیان کردووە و قسەیان نەقڵ کردووە .

لە بابەتەکانیان نەکۆڵیوەتەوە وەك (طبري) . ئەگەر سەیری (طەبەری) بکەین , زۆر بە جوانی بابەتی نەسخەکەی ڕەتکردووەتەوە .

ئەمەش تەفسیرەکەی طبري :

http://quran.ksu.edu.sa/tafseer/tabary/sura2-aya256.html?fbclid=IwAR1-ENqvaDsriUkzypC9WEoC1D7ibb_9q_FePXrC4br3O0dkbu5QOX3YfLs

وە ئەمەش لینکی تەفسیری قرطبي :

http://quran.ksu.edu.sa/tafseer/qortobi/sura2-aya256.html?fbclid=IwAR3CJOLn1tbI2P4pbJ9WpoIAqvtbn93eO7RclsXT5oH9evKQprK2pUxS1Lo

وێنەی تەفسیرەکان :

التفسير (Tafsir (explication ابن كثير - Ibn-Katheer

وقد ذهب طائفة كثيرة من العلماء أن هذه محمولة على أهل الكتاب ومن دخل في دينهم قبل النسخ والتبديل إذا بذلوا الجزية . وقال آخرون : بل هي منسوخة بآية القتال وأنه يجب أن يدعى جميع الأمم إلى الدخول في الدين الحنيف دين الإسلام ، فإن أبى أحد منهم الدخول فيه ولم ينقد له أو يبذل الجزية ، قوتل حتى يقتل .

التفسير (Tafsir (explication الطبري - Al-Tabari

وقال آخرون: هذه الآية منسوخة، وإنما نزلت قبل أن يفرض القتال.

* ذكر من قال ذلك:

5833 – حدثني يونس بن عبد الأعلى، قال: أخبرنا ابن وهب، قال: أخبرني يعقوب بن عبد الرحمن الزهري قال: سألت زيد بن أسلم عن قول الله تعالى ذكره: " لا إكراه في الدين "، قال: كان رسول الله صلى الله عليه وسلم بمكة عشر سنين لا يكره أحدا في الدين، فأبى المشركون إلا أن يقاتلوهم، فاستأذن الله في قتالهم فأذن له.

التفسير (Tafsir (explication القرطبي - Al-Qortoby

الثانية : اختلف العلماء في معنى هذه الآية على ستة أقوال :

( الأول ) قيل إنها منسوخة ؛ لأن النبي صلى الله عليه وسلم قد أكره العرب على دين الإسلام وقاتلهم ولم يرض منهم إلا بالإسلام ، قاله سليمان بن موسى ، قال : نسختها يا أيها النبي جاهد الكفار والمنافقين . وروي هذا عن ابن مسعود وكثير من المفسرين .

( الثاني ) ليست بمنسوخة وإنما نزلت في أهل الكتاب خاصة ، وأنهم لا يكرهون على الإسلام إذا أدوا الجزية ، والذين يكرهون أهل الأوثان فلا يقبل منهم إلا الإسلام فهم الذين نزل فيهم يا أيها النبي جاهد الكفار والمنافقين . هذا قول الشعبي وقتادة والحسن والضحاك . والحجة لهذا القول ما رواه زيد بن أسلم عن أبيه قال : سمعت عمر بن الخطاب يقول لعجوز نصرانية : أسلمي أيتها العجوز تسلمي ، إن الله بعث محمدا بالحق . قالت : أنا عجوز كبيرة والموت إلى قريب! فقال عمر : اللهم اشهد ، وتلا لا إكراه في الدين .

( کۆمکاری عەرەبی ) و سازان دوو ڕووی یەك دراون :

2019/5/30 سەرەتایە بۆ ئاوسبوونی سێ دەوڵەتی عەرەبی , کە شەش مانگ لەمەوبەر لە میدیاکانەوە بڵاویان کردەوە هەتا مانگی شەش بەهاری عەرەبی سەرهەڵدەداتەوە .
لە 2019/6/1 وە , پلانەکان وەك پێویست ڕۆشتوونە .
2019/6/1 زاوا دەچێتە مانگی هەنگوینیەوە و لینگ بە سێ دەوڵەت هەڵدەبڕن. هەتا 2019/7/1 زاوا تێخە و لێخە دەکات و ئامادەکاری دەکات . هەتا مانگی 7 زاوا تۆوی چاکی کردووەتە دەسەڵات و میللەتەوە و , لەو سێ دەوڵەتە ( لیبیا , سودان , جزائیر ) حکومەت دروست دەکرێت .

تۆوی زاوا زۆر موبارەکە , نەوەکانی (قاعیدە) و گروپی جیهادی جۆراوجۆری تری لێ لە دایك دەبن .

ئەم پرسیارانە گرنگن :
1- بۆچی 2019/5/30 زاوا هەڵدە بژێرن ؟
وەڵام : هێزێکی ئەمریکی زۆر لە ناوچەکەیە تەپڵی شەڕێکی مەزهەبی لێدەدەن . سعودیەی سەلەفیزم بانگەشەی بۆ ئەم (کـۆمکارە) کردووە .
پێیان ڕادەگەیێنێت : ئەم سێ دەولەتە لە ئێستادا سەرۆکتان نییە ، سەرۆکی داهاتوو بەدەست ئەمریکایە, بەم مەرجانە ڕازی دەبن دەکرێن بە سەرۆك , ڕازی نابن کەوڵە کۆنەکان دەگێڕینەوە .

2- بۆچی ئەم سێ دەوڵەتە ؟
لیبیا : بێ ساحێبە , سەرۆکی هەیە و نییە ، وەك عێراقە دوو بەشە . ئەو بەشەی حکومەتی تێدایە لە بەشەکەی تر دەترسێت , وەك چەکوش (حەفتەر)یان بۆ دروست کردووە ، چۆن (حەشدی شعبی)یان بۆ ئێمە دروست کردووە .
لە 2019/3/27 مەلیکی سعوودیە (حەفتەر)ی بانگ کرد بۆ سعوودیە . هەفتەیەك دوای ئەو (حەفتەر) هێرشی کرد بۆ (طرابلس) بە پشتیوانیی (مەدخەلییەکان) لە (لیبیا) بۆ لێدانی (جیهادییەکان) . تا ئێستاش سوپاکەی لەوێیە و لە ئامادە باشیدایە .
حاڵی ئێستای (لیبیا) مسۆگەرە و لە جێبی مەدخەلیزم دایە . (لیبیا) ناوجەرگەی شەڕەکەیە . دەتوانین بڵێین : کە (جبل حمرین)ی مغربی عەرەبییە[1] .

---

مغربی عەرەبی[1] : بە تونس و لیبیا و جزائر و مغرب دەڵێن : (مغرب العربي) .

**جەزائیر :** لە ساڵی 91 هەڵبژاردن کرا , ئیسلامیەکان دەرچوون . بە (بوتەفلیقە) جیق و فلیقی ئیسلامییەکانیان دەرهێنا . 28 ساڵە ئیسلامییەکانیان کۆنترۆڵ کردووە . خەڵکانێکی زۆر داخ لە دڵ و جیهادی تێدایە .

**سودان :** لانکەی (قاعیدە)یە ، (اسامە بن لادن) دوای (شەڕی افغان) , لە سودانەوە قاعیدەی دروست کرد . پاشان گەڕایەوە بۆ ئەفغانستان .

سودان وەك ئەندنوسیایە , یەکێکە لەو ولاتانەی بە فتوحات نەبووە بە موسوڵمان . بەڵکو خەڵکەکەی خۆیان بوون بە موسوڵمان . ئەمەش زیانێکی گەورەی لە ئاینی ئیسلام داوە !

چونکە هەر کۆمەڵێك و هەر ناوچەیەك , بە شێوازی تایبەتی خۆیان موسوڵمانن , لەسەر ئاینە کۆنەکانی فیرعەون و ئەفریقیا ماونەتەوە و لەگەڵ ئیسلام تێکەڵیان کردووە . زۆرترین تەریقەتی (سۆفیزمی) تێدایە لە جیهاندا بە بەربلاوی.

سەرەتای شارەزا بوونم لە ئیسلام , لە سۆفیزمەوە دەستم پێکرد و شارەزای تەریقەتەکانی سودانم . لەوێ هەموو شت دەپەرستن و لەگەڵ ئیسلام تێکەڵیان کردووە .

گرنگیی سودان لێرەدایە ..، زۆر بەئاسانی دەتوانن بیانکەن بە قاعدە, بە مجاهد, بە شەیتان پەرست, بە.. هتد...

دەتوانن بیانکەن بە هەموو شتێك بە ناوی دین و ئیسلامەوە . چونکە دینداریەکەیان و باری ئسبەریان لە ژێر سفرەوەیە . دەتوانن لە هەردووك لایەنەکەوە ئیستیغلالیان بکەن .

سودان باشترین کۆگا و مەخزەنە بۆ یاری نێوان ئەمریکا و ئێران و پڕە لە (ئەقڵ سفر) . دەتوانن بیانکەن بە کەرەستە بۆ هەموو شەڕێك .

کێ 11ی سێپتێمبەری بیر ماوە ؟

(بۆش) گوتی : یان دەبێت لەگەڵمان بن یان دەبێت دژمان بن .

ئەمڕۆ لە کۆمکاری عەرەبی , وەلی ئەمر هەمان شت دەڵێت . پشتیشی قایمە هێزێکی سەبازیی ئەمریکی لەناوچەکەیە چاویان لەسەر (سودان و جزائیر)ە ، سودانیش لە جێبی وەلی ئەمر دایە , چونکە مووچەی ئەم مانگەی بۆ ناردن .

**میسر :** (سیسی) لە مێژە لە جێب دایە .

**عێراق :** مسۆگەرە ، کێ بیری دێت ؟.. بەرهەم ساڵح کە بوو بەسەرۆك, یەکەم کاری ئەوە بوو چوو بۆ دەوڵەتەکانی کەنداو و دوای بۆ ئەوروپا و فاتیکان , هەلوێستی عێراقی پێڕاگەیاندن بۆ شەڕە سەگی داهاتووی چوار ساڵی ترامپ و دەبێت پشتگیری بکەن .

**تونس :** حازر و ئامادەیە میلی هێناوەتەوە دەمێکە (السبسي)یان داناوە و دژایەتی ئیسلام دەکات .

**ئوردن :** کۆیلایەتی لە خوێنیاندایە , لە زەمانی (لۆرانس)ەوە باپیرە گەورەیان ( الحسين بن علي شريف مكه ) هەتا ئێستای 2019 پشتا و پشت قایش دەکرێتە ملیان بۆ ئەوەی بە ئینگلیز نەوەڕن .

**مغرب :** گوێ ناداتە هیچ شتێك و چی لێ داوا بکەن ڕازیە , بەس مەلیك لانەدەن .

**پۆستی ( سێوەکەی سەرۆك )** : ............. کە لە **2017/9/29** , بڵاوم کردەوە :

(((   ئەم وێنەیە خوێندنەوەی زۆری بۆ دەکرێت ..

کابرای فەرەنسی جێگاکەی خۆی جێ هێشتووە و کورسییەکەی لە سەرۆك نزیك کردووەتەوە و قسەی بۆدەکات ٠ ئەوی دەستە ڕاستیش بەهەمان شێوە خۆی خوار کردووەتەوە و دەیەوێت بە وردی بزانێت سەرۆك و فەرەنسیەکە چی دەڵێن ؟

تەرجومانی سەرۆکیش لە ناوەڕاست وەستاوە .

بەتەنها سەرۆکیش سێوی پێیە و دەیبڕێت و وردە وردە دەیخوات و تووشی شۆك بووە و داوای شتێکی لێ کراوە کە تووشی شۆکی کردووە !  )))

**وێنەکە :**



**لینکی پۆستەکە :**

https://www.facebook.com/photo.php?fbid=865241506983325&set=a.788884911285652&type=3

**پۆستی ( سێوەکەی سەرۆك و سێوەکەی ئادەم ) :** ............. **کە لە 2018/5/8** , بڵاوم کردەوە :

((( زۆر کەس خڕییەك لە قوڕگیدا هەیە , پێی دەڵێن : (سێوەکەی ئادەم) . مەبەست لەوەیە وەك لە (تەورات)دا باسکراوە , ئادەم سێوێکی خوارد لە قوڕگی گیرا و نەچووە خوارەوە ، بووە هۆی دەرکردنی لە بەهەشت .

منیش لە **2017/9/29** دا پۆستێکم کردبوو لە واڵی فەیسبووکەکەم دا بە ناوی **(سێوەکەی سەرۆك)** , وەك لەسەرەوە دامنا ... کە باسی وێنەی (سێوەکەی سەرۆك)مان کرد .

بەلام کەس هەستی بەمن نەکرد و نەتانزانی سێو مانای چییە و سێوەکەی ئادەم چییە ؟

(سێوەکەی ئادەم) لە قوڕگی سەرۆکدا گیرابوو ، من کاتی خۆی هەستم پێکرد و هۆشداریم دا بە ئێوە .

ئەوە بوو ڕیفراندۆمیان پێکرد , ناوچە دابڕاوەکانیان لێسەندەوە , پێش وەختیش هەر هۆشداریم پێدان کە بەشداری ڕیفراندۆم نەکەن و ناوچە دابڕاوەکان لەدەست دەدەین !

ئەم سێوە ی ئەمجارە کوشندەیە !!

سەرۆکیش وەك من و تۆ مرۆڤە , کاتێك لە دەرەوە دێن و پێی دەڵێن : چی بکات , ئەویش تووشی شۆك دەبێت و سێوەکە لە قوڕگی دەگیرێت . ئەوەی یارمەتی دەدات (سەرۆکی حیزبەکان)ی ترن . ئەوەشی تاوانبارە ( من و تۆ )ی گەلین نەك سەرۆك یان سەرۆکی حیزبەکانی تر . چونکە من و تۆ دەبینە هۆکاری بەردەوامیی هەڵەکان ، بەوەی پشتگیرییان دەکەین و بۆیان هەڵ دەپەڕین و بەرگرییان لێدەکەین و دەنگیان پێدەدەین بۆ ڕیفراندۆم و پەرلەمان و هەموو هەڵبژاردنەکان . بۆیە بەشداری (من و تۆ) لە هەموو دەنگدانەکان دا , تڕی بن گۆمە , بچین و نەچین , چۆنیان بوێت کاندیدەکان دادەنێن ..

یاریی ئەم جارەی کاندیدەکانی بەغدادیش بەم شێوەیەیە :

**یەکەم :** (دکتۆر بەرهەم) .. پشکی شێری بەردەکەوێت , مووچە و باری ئابووری چاك دەکات و پڕۆژەی خزمەت گوزاریی زۆر دەکات ، بەم شێوەیە گەل مەشغوڵی خۆیەتی و بێ ئاگا دەبێت لەوەی کە... ئەو ئافرەتە لەشفرۆش و کاندیدە نەزان و ماستاوچییەکان کە زۆربەیان عەربی نازانن , هەرچی پڕۆژەی بێ ئەخلاقی لە عالەمدایە دەیکەن بە یاسا لە دەستووری عێراقی دا .

**دووەم :** (یەکێتی و پارتی) .. بۆ چوار ساڵی داهاتوو کەمینەن , دەوری فیتنە و شەڕ و ئاژاوە دەگێڕن .

**سێیەم :** (هەموو حیزبە ئیسلامییەکان) .. بە کورد و عەرەبەوە دەوری گەوادی سیاسی دەگێڕن , بۆ ئەوەی غیرەتی موسوڵمان بوروژێنن و موسوڵمانی جیهادی دروست ببێت و بەرەو (جبل حمرين) بچن .

**چوارەم :** (گۆڕان)یش دەوری نابێت شەڕی ناو پرلمانی پێدەکەن و لەم چوار ساڵەدا شەڕی کورسی و لەقە و بۆکس و شەڕی سەیر سەیر دەبینرێت لەناو پەرلەماندا.

**پێنجەم :** سیاسەت قومارە لەوانەیە (شاسوار) بکرێت بە سەرۆکی عێراق و هاوسەنگی سیاسیی عێراق و ناوچەکەش بگۆڕن . وەك چۆن لە سعوودیە گۆڕییان , مەلیك هێشتا ماوە و کوڕەکەی مەلیکیان کردووە بە کەڵەگا بەسەر باوکی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشەوە .

بۆ زانیاریتان .. حیزبە عەرەبەکان و شیعییەکان زۆر لەمانەی لای خۆمان خراپتر و سەقەت ترن .
کەس نەڵێت (سەردار) پێشبینی دەکات... چونکە من فاڵچی نیم و ساحیریش نیم ، من خوێندنەوە بۆ ڕووداوەکان دەکەم . کاتی خۆشی باسی (جبل حمرين)م کردووە , ئەو کاتەی 100 کەسی لێبوون دەیان توانی لەناویان بەرن .
بەڵام ئێستا زۆر بوون و گورزی باش دەوەشێنن . ئەمجارە داعش و ئیسلامی جیهادی , دوور لە شارەکان دەبێت .
لە (جبل حمرين) دایان دەنێن لە ناوەڕاستی عێراقدا . هەرکەس پێی خوار دابنێت لە کورد یان عەرب ..
سنووری بۆ چۆڵ دەکەن و ڕێگا بە داعش دەدەن بۆی بێتە ناو شارەکانەوە .
ئێوەش وەك تاك ئاقڵ بن و خۆتان لادەن لە چەلەحانێی بێسوود , وە هەرکەس شوێن حیزب و لایەنێك کەوت لەپێی بکەن,ئاقڵیش ئەو کەسەیە خۆی نەدات بە کوشت بۆ هیچ حیزب و لایەنێك ئیسلامی بێت یان هەرلایەنێکی تر

دڵنیابن شەڕی (شیعە و سونە)ش هەڵدەگیرسێت , لەگەڵ شەڕی (کورد و عەرەب) . چونکە ساڵی پار هەموو عەرەبە ئاوارەکانیان لە کوردستان گەڕاندەوە و پارەی باشیان پێدان . بۆ ئەم چوار ساڵە پێویستیان پێیان دەبێت .

(حکومەتی هەرێم) فت .. عێراق دابەش دەکرێت .
(سووریا)ش فت .. ئەویش دابەش دەکرێت .
(خەڵکی نیشتیمان پەروەر) فت .. چونکە ئەوانیش ئیستیغلال دەکرێن و شەڕیان پێدەکرێت .
(موسوڵمانی جیهادی) فت .. ئەوانیش ئیستیفزاز دەکرێن و بەرەو لای داعش دەچن .
(هاوڵاتیی عەوام) فت .. وەزعەکان وا تێك دەچێت ئەوانیش نازانن باوەڕ بە کێ بکەن .
(کڵاوەکەشمان) فت .. کە هەزاران ساڵە دەستی پێوە دەگرین با نەیبات , بتەوێت و نەتەوێت فیتنەکان هێندە زۆردەبن کە کەس ناتوانێت دەست بە کڵاوەکەیەوە بگرێت . هەرهەموومان سێوەکەی ئادەم لە قوڕگمان گیر دەبێت

(قیەم و ئەخلاق و بەهاکان) فت .. ئەگەر سەیری کاندیدەکان بکەیت هی کورد و عرب دەزانیت چی ڕوو دەدات و چۆن بڕیاری بێ ئابڕوویی دەردەکەن لەسەر هەموو ئاستێك .

ئەمەت لەبیر بێت : چوار ساڵە کار لەسەر ئەوە دەکرێت عێراق هەمووی برسی بێت . بۆ ئەوەی ئەم چوار ساڵەی داهاتوو پارە هەڵڕێژن و خەڵکی تێربن و گوێ نەدەنە هیچ یاسا و ڕێسایەك و گرنگ ئەوەیە تێر بن و ئێستا خەڵکی هەموو گەیشتووەتە ئەو قەناعەتە ..
کاتی ئەوەیە چوار ساڵی داهاتو کار بکەن بۆ ئەوانەی سەرەوە کە باسمکرد .. هەتا دوێنێ سەرۆکی حیزبەکەت دەیگوت : ڕیفراندۆم واجبە و دەبێت هەموو دەنگی بۆ بدەین . بەڵام ئەمڕۆ دەڵێت : ڕیفراندۆم قوڕی کرد بەسەرمان تۆش بۆ هەردوو هەڵوێستەکە پشتگیریت دەکرد , خۆت بناسە لە گەمژەیەك زیاتر نییت . چونکە هەتا کورد هەبێت ئەم بەزمی ڕیفراندۆمە زوو زوو زیندوو دەکرێتەوە و ساحەکەی پێ دەجوڵێنن . کەی تۆش لەگەڵ جوڵەکاندا بوویت خۆت بناسە : کۆیلە لە تۆ سەربەرزترە . )))
لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/sardar.karem.714/videos/976738215833653/?fref=mentions

**ئێستا هەمووان دەپرسن :**

**( باشە ئەمریکا و ئێران شەڕیانە , ئەم شەڕە بۆ بگاتە لیبیا و ببێت بە جبل حمرین ؟ )**

**وەڵام:**

**کێ (سازان)ی بیر ماوە ؟**

**کاتی سازان قسە لەسەر ئەم بار و دۆخانە کراوە و ئامادەباشی کراوە بۆ ساحەی شەڕی چوار ساڵی کۆتایی ترامپ . سازان پێشەکی بوو بۆ ئامادەکاری بۆ ئەم شەڕانە و ئامادەکردنی ساحەی شەڕەکە , بەوەی کە پێشمەرگە لە ناوچە کوردیەکان نەمێنن .**

**سازان پێشەکی بوو بۆ ریفراندۆم . ریفراندۆم پێشەکی بوو بۆ ئامادەکاری بۆ ساحەی شەڕەکان .**

**ئێستا عێراق ئامادەیە ، پێش ئەوەی ئەمریکا هێز بجوڵێنێت و شەڕی ئەمریکا و ئێران بێتە ئاراوە ...**

**الحمدللە من هەستم بە مەترسیەکان کردووە و دەمزانی عێراق ئامادە دەکرێت بۆ شەڕێکی درێژ خایان ..**

**لە 2018/11/26 پۆستێکم کرد و گوتم :**

**((( من بۆنی خوێن دەکەم ، حەز ناکەم هیچ کەسێك لە دیندار و بێدین دڵۆپێك خوێن لە لوتی بێت . ناوچەکەش بەرەو شەڕ و کوشتار دەڕوات ... )))**

**لینکی پۆستەکە :**

https://www.facebook.com/groups/1683635728590809/permalink/2248392412115135/

**الحمدللە زانیویشمە حکومەتی هەرێم نامێنێت و فەشەل دەهێنێت و پەرلەمانی کارتۆنی دروست دەکرێت ..**

**لە 2018/8/12 پۆستێکم کرد و گوتم :**

**((( ئەمڕۆ 12ی مانگە .. سێ مانگ تێپەڕیوە بەسەر هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراقدا ...**

**ئەمڕۆ 12ی مانگە .. هیچتان بیرتان نەماوە کەی هەڵبژاردن کرا و نەتیجەکەی چی بوو ...**

**ئەمڕۆ 12ی مانگە .. سێ مانگە لینگی دیجلە و فورات بەرز کراوەتەوە, (ئەمریکا و ڕووس و بەریطانیا و ئەوروپا و ئێران و تورکیا) تۆوی تێدەکەن .**

**ئەمڕۆ 12ی مانگە .. لە مانگی نۆ دا لینگ بە سلێمانی و هەولێریش بەرز دەکەنەوە .**

**ئەمڕۆ 12ی مانگە .. دوای تۆو کردنە هەولێر و سلێمانی جارێکیتر 12ی مانگی نۆ دێت .**

**ئەو 12ی مانگی نۆیە , دەبێت بە چوار مانگی ڕێك و سۆنەر بۆ بەسرە و هەولێر و سلێمانی دەکرێت و دەزانرێت چیمان دەبێت ! ... لە پاش ئەو 12ی مانگی نۆیە , هەتا 12ی مانگی دە , حکومەتی عێراق دروست دەبێت , لەو زۆڵ و بیژیانەی کە چوار مانگە لینگیان پێ بەرزکراوەتەوە . بەخێربێن بۆ دەوڵەتی لینگ بەرز پێکراوەکان ...**

چەندین ساڵە یادی (سۆشیالست) دەکرێت بەبێ مانهۆڕ .. مانهۆڕی (حەمەی حاجی مەحموودی) مورتەزەقەش زەنگی خەتەرە و ناوچەکە بەرەو شەڕی بە وەکالەتی ئێران و ئەمریکا دەچێت .
ئەمڕۆ 12ی مانگە .. ئەو مەخزەنی چەکانەی دەیانگوت تەقینەوە ئێستا دەرکەوت کە یەکێتی و پارتی , بە ڕێنمایی ئەمریکا و ئێران داویانە بە کاکە حەمە .
منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ و چاوەڕوانی دابەشکردنی عراق و سوریا بن هەتا مانگی شەشی 2019 .
لە یادیشت نەچێت , دەبێت هەتا ئەوکاتە (جبل حمرین) پڕ دەکرێت .

ئەمڕۆ 12ی مانگە .. خاڵە گیان سەر سوچەکە دابەزین هەیە .
پەرلەمان و حکومەتی هەرێمیش فت ..
ئینتیخاباتی (پەرلەمانی هەرێم) هێندە ئاڵۆزە , هێز نییە سەری لێدەر بکات ..
پاش هێزی کاکە حەمە چاوەڕوانی هەمو موفاجەئاتێکی قۆڕ و سوك و مندالانە بن .
بە هەموو پێوەرێك , پارچە پارچە بوونمان مسۆگەرە و ئیحتمالی کردنی ئینتخاباتیش زۆر زۆر کەمە بە بۆنەی ئەگەری کردن و نەکردنی ئینتیخابات . دەبێت بە پێشەکی بۆ پارچە پارچە بوونی هێزەکان و دەسەلات و شارەکان.
ئەم بەزمی دابەشکردن و دواخستنی ئینتیخاباتە شتێکی نوێ نییە و ساڵ و دوو مانگ پێش ئێستا باسم کردووە .
ئەوەی گرنگە هەر شتێك ڕوودات تەداخول مەکەن و بەشداری هیچ قەرەباڵخیەکیش مەکەن تەنانەت لەدووریشەوە سەیر مەکەن میدیاکان وێنەتان بگرن و بۆ ڕیکلام نیشانتان بدەن . بڵێن: لایەنگرانی فلان ڕووداو زۆرن و پشتگیری خۆیان نیشاندا .
چاکترین چارەسەر ئەوەیە : هەموو حیزبە ئیسلامی و عەلمانیەکان ڕیسوا بکەین , بەوەی قەرەباڵخیان بۆ دروست نەکەین و ئەگەر گوتیان : ماست سپییە ئێمە بڵێین : ڕەشە ... )))

لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/sardar.karem.714/videos/1057631487744325/?fref=mentions

مەبەستی من ئەمەیە :

کاتێك هێزی ئەمریکا دەیەوێت کارێك بکات , هێز و دەسەلآتی هەیە . فەرمان دەدات دەبێت فلآن شت بکەن ، هەر کەس ناڕازیە لێیدەدەین و ڕسوای دەکەین . هەرکەسیش ڕازیە بەشی خۆی لە کێکەکە دەخوات .

2019/5/30 هەمان سێوی سەرۆك , لە قورگی دەوڵەتە عەرەبیەکان گیر دەکرێت !

پلانەکە بەم شێوەیەیە :

(لیبیا) دەکرێت بە ساحەی شەڕ , جارێکی تر قاعیدە زیندوو دەکرێتەوە . پاشان لیبیا شوێنێکی ستراتیجی هەیە .

سنووری لەگەڵ ( سودان و میسر و تونس و جەزائیر ) هەیە .

لەو چوار ولآتەوە بە ئاسانی خەڵکی دەچنە ناو لیبیاوە بۆ ساحەی شەڕەکە . وردەشەڕ و پشێوی و تەقینەوەش لەو چوار ولآتە دروست دەکرێت , بەلآم کەم دەبێت .

ئامانجی ئەم شەڕانە , ناشیرین کردنی ئیسلامە , لە ڕێگای جیهادەوە . دەبێت بڵێین ڕەحمەت لە داعش و شێوازی کوشتنەکانیان . بە قێزەونترین شێوە کوشتن و ماڵ وێرانی دەکەن . جگە لە کاری تری تێکدان کە تا ئێستا بەئەقڵی کەسدا نەهاتووە .

(لیبیا) دەبێت بەبنکەی سەرەکی بۆ معەسکەراتی (قاعیدە) . دەبێت بەگەورەترین کۆگا و مەخزەن , بۆ دروستکردنی موسوڵمانی جیهادی .. لەم مەخزەنەوە مجاهدین دەنێرن بۆ (عێراق) بەناوی شەڕی (شیعەی ڕافیزە) و بەناوی پشتگیری لە برا سونەکان .

2019/5/30 ئامادەکاری دەکرێت بۆ ژیاندەوەی (قاعیدە) و دانانی بنکەکان بۆیان و ئاسانکاری بۆ هات و چۆیان .

لەوانەیە جگە لە لیبیا و عراق پشێوی بخەنە ولآتانی ترەوە.. بەلآم تا ئێستا , ئەگەرەکان لەسەر لیبیا و عێراقە .

2019/6/1 ، لە ماوەیەکی کورت دا حکومەت لە (جەزائیر و سودان) تەشکیل دەکرێن . بۆ ئەوەی مجاهد بنێرن بۆ (لیبیا) . هەر ئەمساڵ لە (تونس) ئینتیخاباتە و ئەو حیزبەی دەری دەچوێتن , کار لەسەر ئەوە دەکات ئیسلامیەکان ئیستیفزاز بکات .

لەسەر ئەم باسە نارۆم و خۆتان لە میدیاکان هەموو شت دەزانن . ئەم پشێویە هەتا 2025 بەردەوام دەبێت , چونکە کاتی هەڵبژاردنی ئەمریکایە , دوای هەشت ساڵ لە حوکمی ترامپ .

2019/5/30 (ئەمریکا) نامەیەکی نارد بۆ (کۆمکاری عەربی) ,دەبێت بە قسەی وەلی ئەمر بکەن , ئەوەتا شەش تەقینەوە لە کەرکوك کرا , وە حیزبی نوێی شیعە دروست کرا .

ولآتە عەرەبەکان ئێوەش دەبێت هاوکاری ئەمریکا بن .

ئەوەی گرنگە لەم هاوکیشەیە دا (عێراق)ە , من قسە لەسەر ناوچەکانی خۆمان دەکەم . پارچە پارچە دەکرێت .
الحمدلله 2017 ئەقڵم بەمە شکاوە و ئێستا بەرهەمەکەی دەبینن :

لە 2017/12/16 ............... پۆستێکم کرد و گوتم :
((( بە گوێرەی تەقاندنەوەی پردی (پردێ) و سنووردانانی پارتی , مانگی( 1 و 2)ی ساڵی تازە ڕووداوی سەیر ڕوودەدەن و هێزەکانی (70 و 80)ی پێشمەرگە جیادەبنەوە و تەرازووی هێزەکان دەگۆڕدرێن بۆ بەرژەوەندی هێز و دەم و چاوی نوێ ... لە مانگی 3 دا وەزعەکان هەمووی چاك دەبن و کێشەکانی بژێوی ژیان هەمووی چاك دەبێت و ئەو چاکسازیانە ئامادە باشییە بۆ هەڵ بژاردنەکانی مانگی 6 .
هەوڵ دەدرێت گروپی جیهادی (کورد و عەرەب) دروست بکرێت و لە (جبل حمرین) دابنرێت و ببن بەجێگری (داعش) . وە ئیحتیمالی 50٪ هەیە (مامۆستا کرێکار) لە ڕێگای (ایطالیا)وە سنوورداش بکرێتەوە و بە پلانێك لە ناو عێراقەوە لە سجن ڕزگار بکرێت و بەرەو (جبل حمرین) ببرێت .
من و تۆش وەك هاولاتی و وەك موسوڵمان , ئەوەی لەسەرمانە شوێنی هیچ گروپ و کۆمەڵێکی جیهادی یان دنیایی نەکەوین و خۆمان نەدەین بە کوشت . چونکە هەمومان (تالیبان و قاعدە و داعش)مان بینی , دەستکردی مخابەرات بوون . وە (یەکێتی و پارتی)شمان بینی , دستکردی سیاسەتی نێو دەوڵەتی بوون و هێندەیان زەلیل کردووین کە بە روبعە موچەش ڕازین... )))

لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/sardar.karem.714/posts/902440636596745

هەر 2017 پاش ڕیفراندۆم , دەوری سەرەکی بۆ ئەم دوو پاڵەوانەش داندرا الحمدلله کاتی خۆی نەمهێشت باز بدەن و پۆستم کردووە . ئەمانەش دەبن بە پاڵەوانی ساحەکە و خوێن ڕشتن ..
لە 2017/10/25 ............... پۆستێکم کرد و گوتم :

((( خوێندنەوەتان چییە بۆ ئەم وێنەیە ؟ مامۆستا عەلی باپیر و بانگخواز عومەر چنگیانی پێکەوە کۆبوونەوە دەکەن , وێنەکە نوێیە هی دوای ڕیفراندۆمە . من سبەینێ ڕای خۆم دەڵێم چاوەڕوان بن ... )))



لینکی پۆستەکە : https://www.facebook.com/groups/1683635728590809/permalink/1985270421760670/

وە لە 2017/10/26 ............... پۆستێکم کرد لە بارەی کۆبوونەوەکە و گوتم :

((( کێ حەز دەکات جیهاد بکات ؟.... هەموو موسوڵمانێك دەڵێت من . ساحەکەش ئامادەباشیی بۆ دەکرێت . بە گوێرەی ئەو سەردانەی (عمر چنگیانی) بۆ لای ئەمیری کۆمەڵ (مامۆستا عەلی باپیر) , من بە سەردانێکی ئاسایی دانانێم و خوێندنەوەم ئەوەیە : لە داهاتوو دا .. چەکداری ئیسلامی دروست دەکرێت لە کوردوستان و پارەی خەیاڵییان بۆ هەڵدەڕێژن ... لەبەر هەرهۆکارێك بێت , دەبن بە دوو بەش و زیاتر بەشێکیان دەچن بۆ شاخ و یاخی دەبن ... ئەو دوو بەشەی شاخ و ناو شار دەبن بە چەند بەشێکەوە . منیش ئەم خوێندنەوەیەم هەیە ئێوەش گاڵتەم پێ دەکەن. داواکارم لە ئێوە هەرگروپێکی چەکداریی ئیسلامی دروستکرا , نەچنە ناویان و چەك بۆ هیچ لایەنێکی ئیسلامی هەڵنەگرن , گوێ لە هیچ مامۆستا و مەلا و بانگخوازێك نەگرن تەنانەت لە مامۆستا کرێکاریش . خۆت مەدە بە کوشت بۆ هیچ مخابەرات و دەوڵەتێك . ئاقڵ بە و دەرس وەرگرە لە داعش و قاعدە و گروپە جهادیەکان , مێژوو سەد بارە دەبێتەوە . تۆش ئازادیت چی دەڵێیت و چۆن بیردەکەیتەوە , بەڵام کە ڕووداوەکان ڕویاندا ئەم قسانەی منت لەبیر بێت .. )))

لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/sardar.karem.714/posts/877093325798143?hc_location=ufi

وە 2019/6/1 دەڵێم :

((( ( وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ )

خودا پێمان دەفەرمووێت : ئاین هیچ ئیحراجییەکی تێدا نییە و ئەوەی خودا بۆی داناوین نابێتە مایەی نەنگی و ئیحراجی و هەست کردن بە عەیبە . چونکە ابراهیم (علیە سلام) یەکەم جار ناوی لێناین (مسلم) . واتا تەسلیم بوون بە ئەمری خودا باش و خراپی . پێغەمبەریش(ﷺ) شاهیدی دەدات بەوەی کە ئێمە مسلمین و سەر بە ئیسلامین و بەو ناوەوە ناسراوین .

کەواتە (کۆمەڵ و عەلی پابیر) بۆچی ئیحراج دەبن کە پێیان بڵێن ئسلامی و ئەو نازناوە لێدەکەنەوە لە خۆیان ؟

یان ئەمە پلانێکە پێش وەخت دارێژراوە لە ساڵی 2017 وە ئامادەکاری بۆ کراوە و ئێستا دەبێت بچێتە بواری جێ بە جێکردن . (عەلی باپیر)یش کەسێکی بە توانایە و خاوەن ئەزموونە لە گێڕانی فیتنە و شەڕدا , خەڵکی بیریان ماوە چۆن خەنجەرێکی ژەهراوی بوو , لەپشتی حەرەکەی ئیسلامی دا لە ساڵەکانی نەوەدەکان دا ... فلیم و هەڵپەڕکێی ئەم شەش ساڵەی داهاتووی دەبێت چەپی بێت یان سێ پێیی ؟... منیش وەك ئێوە چاوەڕوانم و بینەرم .

الحمدلله دوو ساڵ لەمەوبەر هەستم بەم هەڵپەڕکێیە کردووە .. کاتێك لەگەڵ ئەو (چنگیانی)ە دانیشتن . زانیم پلانیان هەیە بۆ کوشتنی موسوڵمانی کورد .... چاوەڕوانی دەوری (چنگیانی) بن .. بزانن ئەم شەش ساڵەی داهاتوو لەگەڵ (باپیرە) چۆن و بۆ کێ سەرچۆپی دەگرن ؟ .. )))

https://www.facebook.com/sardar.karem.714/posts/1253005381540267

لە سەرەتای 2018 ش زانیم (سەلەفیەکان) تێوەدەگلێنن و ئەوانیش پاڵەوانێکی تری ساحەکەن .
خۆشتان بینیتان چۆن (عەمید سەرحەد قادر) هاتە ساحەکە و بە یەك کورتە ڤیدیۆ دوعا بۆ زۆنی زەرد کرا !

وە لە 2018/1/1 ............... پۆستێکم کرد لە بارەیانەوە و گوتم :

((( لە ساڵی 2018 دا ئاڕاستەی یاری و شەڕەکان دەگۆڕردیێت و شەڕی فکر بونوی نامێنێت و زۆر کەم دەبێتەوە , ئەم جارە لەبری (سەلفی دەقی مەدخەلی) , سەلەفی ڕەق و شەق و توندڕەوی جیهادی دێتە ساحەکەوە .
لە مانگی 2 هەتا کۆتایی 4 دەتوانم 100٪ خۆم و ئێوەش دڵنیا بکەمەوە لەم هەواڵە .
وە ئەم حەرەکە جیهادییە تازەیە , جێگری داعشە و چالاکیان لە (جبل حمرین) دەبێت . پێشنیارم بۆ ئێوەش ئەوەیە : خۆتان بەدوور بگرن لێیان, چونکە قاعیدە نەما و داعش هاتە جێگای , وە داعش نەما و ئەم حەرەکە تازەیە دێتە جێگای , پێکهاتەکەی کورد و ئەو عەرەبانەی کوردستانن کە دوای ڕیفراندۆم گەڕانەوە بۆ ناوچەکانیان .
ئێوەش چاوکراوە بن و تێبگەن کە ئەمە جیهاد نییە و دروستکراو ی مخابەراتە و بۆ شەڕی تایفی دروست دەکرێن لە نێوان (کورد و عەرەب) و (شیعە و سونە) . لە فەیسبووك و لە دەرەوەش مەکەونە داویانەوە , چونکە دەزگاکانی هەواڵگری لە ڕێگای مناقشەکردن و باسکردنیان دێنە ناو باسەکان و فشار دەخەنە سەر خەڵکەکە بۆ ئەوەی ئیزعاج ببن و بچنە ناویان . ڕووداو و شتی سەیر دەخوڵقێنن بۆ ئەوەی غیرەتتان ببزوێنن و بچنە ناویان . ئاقڵ بن و لە ڕووداوەکان و قسە و پۆستەکان تێ بگەن .......
تێبینی : ئەوەی ئێستا باسی دەکەم پلانێکی شەش ساڵەیە , بۆ ئەو ماوەیە دانراوە کە (ترامپ) سەرۆکایەتی دەکات و سەرۆکی دوای ترامپ کە دێت ئەم حەرەکە جیهادییەی (جبل حمرین) دەبێت ئێکسپایەر ببێت و حەرەکەی تر دروست بکرێت ... )))

لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/groups/1683635728590809/permalink/2016247575329621/

وەك دەزانن مەدخەلیەکان ڕەقەمن و نابێت لەم یارییە دووربن و بەشداری شەڕ و پێکدادان و خۆپیشاندان و دەنگدان نەکەن , و وەك جاران دووربن و ملی سەدان ئایەت و حەدیس بشکێنن بۆ ئەوەی پشتگیریی وەلی ئەمر بکەن و دووربن لە ڕووداوەکانەوە , ئەمانیش دەبێت جارێکیتر ملی ئایەت و حەدیس بشکێنن بۆ شەڕی داهاتوو .
ئەم کارەش کتوپڕ نییە و ساڵێك زیاترە کاری بۆ دەکرێت و ئێستا کاتی هاتووە بەرگی مەدخەلی فڕێ بدرێ و بە بەرگی نوێوە بێنە ساحەکە ,

بەڵگەشم ئەم پۆستەیە ,
کە 2016/11/5 لە گروپی مەدخەلیەکان کردوومە :

((( ئاگاداری (دلێر گەرمیانی) بن !!... حیزبیە و موبتەدیعە و کەس نابێت قسە لەگەڵ حیزبی و موبتەدیع دا بکات .

منیش پرسیارێك لەم برایانەم دەکەم کە لێرەن وە دەڵێم : ئایا جائیزە لە دوێنێوە ئێمەش سەلام لە مامۆستا (دلێر) بکەین یان تەلەفۆنی بۆ بکەین ؟ ...)))

لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/groups/Good.Salaf.Call/permalink/922986894468893/

دڵنیام لە 1000 کەستان 1 کەس تێ دەگەن و 999 تان بە مجاهیدی دەبینمەوە خۆتان دەدەن بە کوشت و لەسەر سەهۆڵ بۆتان دەنوسرێت .
چونکە ئەقڵی کورد سنووردارە و بەس ئەو ساتە دەبینێت کە تێیدایە و حساب بۆ پێنج دەقە پێش ئەو ساتە ناکات و پلانی نییە بۆ پێنج دەقە دوای ئەو ساتە

الحمدلله کورد قەومێکی نوستووە و هەمووی حەبی (ڤالیۆم)یان خواردووە, کەسیان خوێندنەوەیان نییە تەنانەت بۆ ژیانی ئاسایی خۆشیان .
کەواتا چۆن خوێندنەوەیان دەبێت بۆ ڕووداوە سیاسیەکان ؟

بۆیە کۆتایی باسەکەم زۆر کورت دەکەمەوە . چونکە لێرە بەدواوە خوێندنەوەیە بۆ داهاتوو بەگوێرەی ڕووداوەکان .
ئێستا ئەشکەوتیەك پەیدا دەبێت دەڵێت بەس خوا (عیلمی غەیب) دەزانێت تۆ چییت ؟
ئێنجا وەرە ئەم (ئەشکەوتیە لۆرانسییە کۆپی و پەیستە) لە جەهالاتی سیاسەتی داڕێژراوی (لۆرانس) دەربهێنە .

بەقەناعەتی من لە ماوەی داهاتوودا جارێکیتر مەسەلەی ئیعدام کردنی ئەو 3 بانگخوازە سعوودیە زیندوودەکرێتەوە .
( الشیخ سلمان العودة ، د. عوض القرني , د. علي العمري ) ..

تاکە کەس بتوانێت ڕزگاریان بکات , ترامپی برا گەورەیە .. بەم شێوەیە هەستی جیهادیەکان ڕادەکێشن بەلای ئەمریکا دا . وەك وەرەقەیەك بەکاری دەهێنن دژی شیعە.. ئیتر کەیە و چۆنە و یاریەکە چۆن دەڕوات ؟
(العلم عند الله) . بەڵام لە ڕوودانی 100٪ دڵنیام .

بۆ ئەوەی باسەکە دوور و درێژ نەبێتەوە . لێرە دێمە خاڵی کۆتایی و سیناریۆکان بەم شێوەیەیە :
هێزێکی ئەمریکی زۆر لە ناوچەکەیە بە ناوی شەڕی ئێرانەوە . ئەم دوانە شەڕ ناکەن و لەبری ئەوان شەڕ(کەر) هەیە ئەم کەری شەڕانە (شیعە و سونە)ی عەوامی گێلن . زائیدەن (کورد), شەڕەکان زیاتر شەڕی (عەقیدە و مەزهەبین) ئامانجی سەرەکیان ناشرین کردنی ئیسلامە . زائیدەن شەڕی (قەومی) و هەر شەڕێك بە خەیاڵتاندا نایەت , بەرپا دەکرێت . یەخەی هەمووان دەگرێت , لە ئینتەرنێت و ناو بازاڕەکانیش .
وە براوەی سەرەکی (ئێران و شیعەیە) و دەبێت ببن بە پاڵەوان و زلهێز لەسەر ئاستی هەموو جیهان .
شەڕەکانیش بەسپۆنسەری (مانگاکانی سعوودیە و لۆرانسیەکان و سەلەفیەکانە) .

وە من ئەم شەڕەی پێنج ساڵی داهاتوو بەمایەی خێر دادەنێم بۆ ئاینی مەزنی ئیسلام ..

ئێستا هەمووان وادەزانن دنیا کاول دەبێت و نامێنێت . ئیسلام فەشەل دەهێنێت , چونکە سعوودیە لاواز دەبێت و شیعە و ئەمریکا سەردەکەون... هەموو کارێك لای خودا و لای خەڵکیش (کار و کاردانەوە)یە . کەواتا دەبێت سەرەتا لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدەینەوە ...

لە مێژوودا خودا پەیامبەرانی ناردووە ، ئەو قەومانە یان شوێنی کەوتوون یان شوێن پەیامبەرەکە نەکەوتوون .
خەڵکەکە داوایان کردووە ئەگەر خودا خاوەن دەسەڵاتە با لەناویان بەرێت یان ئەوەی ئەو پەیامبەرە دەیڵێت با بێتە دی و خودا دەسەڵاتی خۆیانی نیشان بدات .. ئەو قەومە تووڕەیی خودایان بەسەردا ڕژاوە و لەناو چوون ..
وە ئاگاداربە بەهەڵە لەقورئان تێنەگەیت !
سەیری هەموو قەومەکان بکە کە لەناوچوون , لەسەر داواکاری خۆیان لەناوچوون نەك خودا غەزەبیان بەسەردا بباریێنێت .. خودا دەزانێت ڕۆژێك دێت خەڵکی زۆر زۆر دەبن و زەمان دەگۆڕێت ، بۆیە کۆتا پەیامی لە شێوەی کتێب ناردووە و ئەویش (قورئان)ە ، ئەگەر وا بزانیت (تەورات و ئینجیل) کتێبن , ئەوا هەڵەیت و لە قورئان تێنەگەیشتوویت . جا بۆ پاراستنی ئەم قورئانە دەسەڵاتمان پێویستە .

خۆتان دەزانن **1400** ساڵە ئەم کتێبە هەیە و دەسەلاتی (ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی) ئەم کتێبەیان پاراستووە .
بەوەی نەیان هێشتووە هیچ دەوڵەت و یاسایەکی دەرەوەی جیهانی ئیسلام بێتە ناو ئیسلامەوە .
ڕوونتر دەڵێم : ئەوەتەی ئێمە هەین ، مەبەستم (جیلی دوای جەنگی جیهانی یەکەم)ە . (ئەمریکا و ڕووس و ئەوروپا و ئینگلیز) یاریمان پێدەکات.. بەلام پێش جەنگی جیهانی هیچ ولاتێك نەیتوانیوە لە سنوورەکانیشمان نزیك بێتەوە .

ئێمەی موسوڵمان لە هەموو بوارەکانی تەکنەلۆجی و کارگەکانی دروست کردنی شمەکی ئاسایی و تەقەمەنی و هەموو بوارەکانی ژیانەوە ، فاشیلترین قەومین !

زەمانی (عوسمانی) ئێمە وا نەبووین و ئەوەی (ئمریکا و ئەوروپا و ڕووس و ئینگلیز) هەیبوو ئێمەش هەمان بووە بە زیادەوە . ئەوەتا دەبینن هەتا ئێستاش (تورکیا) وڵاتێکی پیشەسازیە و هەموو صنعاتێکی تێدایە . وڵاتەکانی تری ئیسلامی هیچیان تێدا نیە .

خاڵی گرنگ ئەمەیە :
(شیعەی رافیزە) 1350 ساڵە هەیە و لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلام بۆ دەرەوەی دوورگەی عەرەب بوونی هەیە .
ئەم شیعانە لەو ماوەیەدا چەندین جار دەسەڵاتیان ڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆ گرتووەتە دەست .
بەلام هێز و دەسەڵاتی ئیسلامی ڕاست ، لایان داون و لەناویان بردوون یان بێهێزیان کردوون و دەسەڵاتیان لێ سەندوونەتەوە .

خاچ پەرستەکان 13 جار هێرشیان کردووە بۆ سەر زەوی موسوڵمانان و تێك شکێندراون . کە کۆتا جاریان (صلاح الدین الایوبي) بۆ تا هەتا تێکی شکاندن .

ئێستا با بگەڕێنیەوە بۆ زەمانی ئێستامان... لە دوای (جەنگی جیهانی یەکەم)ەوە ، دەسەڵاتی ئیسلام و ئاینی ئیسلام لە لایەن شەریفی مەککەوە ڕووخا بە ناوی (شۆڕشی قەومی عەرەبی دژی تورك) .
واتا ئەم (ئال سعوود)ەی ئێستا خۆیان بە ئەسڵی ئیسلام دادەنێن بناغەی دروستبوونیان بەناوی (نەتەوە پەرستیی عەرەب)ەوە (لۆرانس) دروستی کردن و دەوڵەتی ئیسلامی پێ ڕووخاندن .

(لورانس) لە ڕەحمی ئەوروپاوە دەرچووە و شارەزای (ئاینی کڵێسا) بووە و کەسێکیش بوە لەوانەی زۆر معجب بووە بە (خاچ پەرستەکان) . بۆیە زانیویەتی چۆن ئاینی ئیسلام دەفەوتێنێت ...
سەرەتا هاتووە ... بەناوی (قەومی)ەوە شۆڕشی بە عەرەب کردووە ، بۆ ئەوەی ناوی ئیسلام و ئیسلامی نەهێڵێت .
هەروەك چۆن (عەلی باپیر) شیعاری (لا اله الا الله)ی لە لۆگۆکەیان لابرد . ئێستاش خەریکە کە پاشگری ناوی (ئیسلامی)ەکە , لە (کۆمەڵ) لادەدات .

پاسان (لۆرانس) هات و سوودی لە ئەزموونی کۆنی مێژووی ئەوروپا وەرگرت .. دەسەڵاتی (ڕۆمی کاثۆلیکی) لە (زەوی وەحی) و مەککە و مەدینە دروست کرد.
(کاثۆلیك) واتا (پاپای فاتیکان) ، لەسەر ئەو بناغەیە دامەزراو(کورسی پاپا) واتا جێگری خودا لەسەر زەوی .

ئەم جێگرە بە ناوی خودا و ئاینەوە حوکم دەکات . دەبێت هەموو ئیمانداره مەسیحیەکان شوێن پاپا و دەسەڵات و کورسیەکەی بکەون .

ئەم ئاینە کاثۆلیکەی (لۆرانس) کە داینا . هات (سەلەفیەت)ی دروستکرد لە هەموو جیهانی ئیسلامی دا ،
ئەم سەلەفیانە مەرجەعیان بۆ ئاین , (دەسەڵاتی سعوودیە)یە ، واتا کورسیی پاپا لە (ریاض) .
ئەم سەلەفیەتە باڵی دووەمی کڵێسایە , پێیدەڵێن : (ارثدوکس) . واتا ئەسڵی ئاین لای (ارثدۆکس)ەکانە .
کڵێسای ارثدۆکس دەڵێن : ئەسڵی دین لای ئێمەیە .

**چونکە مەسیح (علیە سلام) لە ڕۆژهەڵاتەوە سەری هەڵداوە . (ارثدوكس) واتا : ئیمانی ڕاست و دروست .**
**سەیری سەلەفیزم بکەن.. ئیمانی ڕاست لای ئەوانە و هەموو موسوڵمانەکانی تر گومڕا و سەرلێشێواون .**
**ئەم ئاینە (ارثدۆکسە)یان لە باڵی دووەم دروست کرد : ئەویش (محمد بن عبدالوهاب)ە .**

**(لۆرانس ئاقڵە) ، هات (لاهوت)ی (پۆلص)یشی تێکەڵ بە (کاثۆلیك) و (ارثدۆکس) کرد !**
**(لاهوت) واتا: بینینی شاردراوە و ڕۆحی , بۆ ئاین و دەقی ئاینی .**
**وەك چۆن (سۆفیەکان و شیعە) خوێندنەوەی ڕۆحیان بۆ ئاینی ئیسلام داناوە .**
**ئەم (لاهوت)ەی سەلەفیزم , زۆر بە ئاقلانە دانرداوە.. ئەوان دەڵێن : شوێن سەلەف کەوتووین ..**
**وە ئێمە پەیوەندیمان بە سعوودیەوە نییە .**

**(لۆرانس)یش بەتوانایە ، ئاینێکی (لاهوتی)ی بۆ دروستکردوون . کە (سەلەفی) خۆشیان ئەقڵیان پێناشکێت , کە چۆن شوێن (لاهوت) کەوتوون ؟**
**با هەموو سەلەفیەك ئەم پرسیارانە لەخۆی بکات :**
**کێ بوو یەکەم کەس لە مێژووی ئیسلامدا گوتی: من سەلەفیم ؟**
**کێ بوو یەکەم کەس کە ڕەوتی سەلەفی دامەزراند ؟**
**کتێب و سەرچاوە و پەیڕەو پڕۆگرامیان چی بوو ؟**
**لە ساڵی چەند دروست بوون ؟**
**کام مزگەوت هی ئەوان بوو و تێیدا کۆدەبوونەوە ؟**

**وەلام :**
**هیچ سەرچاوەیەك نییە , باسی سەلەفی و مەنهەجی سەلەفی بکات .**
**کەواتا ئێستا بۆ بەئێوە دەڵێن : سەلەفی ؟**
**بۆ مزگەوتەکانتان جیایە ؟ بۆ مامۆستاکانتان جیایە ؟**

**لە هەمووی گرینگ تر :**
**هەر کەس دەڵێت سەلەفیم ، پەیڕەو پرۆگرام و ئاینیان لەسەر بنەماکانی (محمد بن عبدالوهاب) وەردەگرن .**
**کە دەکاتە باڵی (ارثذۆکس) و (لاهوت)ی (محمد بن عبد الوهاب) دەخوێنن . نەك بنەما و ئەسڵی ئیسلام .**

**هەر کەس شارەزا بێت لە مێژوی ئەوروپا دەزانێت کە باڵی (پرۆتستانت)یشیان هەیە .**
**(لۆرانس) کورسی دەسەلاتی (پاپایی کاثۆلیکی) دانا بۆ (مەلیك) و بانگخوازەکانیان لە دەرەوەی دوورگەی عەرەب .**
**وە (ارۆذۆکس و لاهوت)ی بۆ دانان لە ڕێگای (محمد بن عبدالوهاب)ەوە.**

لە بەرامبەریشدا خودا هەیە و خاوەنی ئەم ئاینەیە دەبینێت و دەبیستێت چی ڕوو دەدات .
ناکرێت ئاینەکەی تێك بچێت و ئەویش بینەر بێت !
( وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا ۖ وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ )

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئاینی (پرۆتستانت) بێتە ناو ئاینی ئیسلامەوە .
وەك پێشتر گوتم: دەسەڵاتی سعودیە بە هیچ کەس نارِوخێت و ناتوانین بەرەنگاری ببینەوە .
سەد ساڵە (دین و قورئان و حەدیس و لاهوتی وەهابی) دەفرۆشن بە هەموو دنیا .
ئێستا کاتی ئەوە هاتوە نەوەکانی (لۆرانس) زنجیرەی یاریەکەیان تەواو بکەن و ئاینی (پرۆتستانت) بە وەهابیەکان تطبیق بکەن.

(پرۆتستانت) واتا چاکسازی . خۆشتان دەبینن سعودیە خەریکی چاکسازییە . ئەو چاکسازیەش واتا هەڵوەشانەوەی ئەو (فەتوا و حەلاڵ و حەرامیانە)ی سەد ساڵە دایان ناوە بە ناوی ئاینەوە .
ئەمەش واتا : لاوازکردنی ئاینی ئیسلام و بیروباوەڕی موسوڵمان بەرامبەر بە دین .
100 ساڵە وا دەزانن : لێخوڕینی سەیارە بۆ ئافرەت حەرامە ، بەلام ئێستا دەڵێن حەلاڵە !
100 ساڵە وا دەزانن : گۆرانی حەرامە , بەلام ئێستا (راغب علامة) لە سعوودیە کۆنسێرت دەکات !
لە داهاتوودا بۆ ماوەی ئەم شەش ساڵەی داهاتوو ، هەموو ئاینی سەلەفیزم هەڵدەوەشێتەوە بە (پرۆتستانت) .

پرسیاری سەرەکی ئەمەیە :
سەلەفی عەوامی نەزان دەڵێت : " ئێمە هەقی سعوودیەمان نیە و لای ئێمە هەر حەرامە ."
منیش دەڵێم : تەحەدات دەکەم , ئەو حەرامیانەم بۆ بهێنێت (بەدەق و بەفەتوا) لە پێش جەنگی جیهانی یەکەم .

ئەوە عەرز و ئەوە (نەك گەز), بەڵکو خێرایی تیشك ... فەرموو بێجگە لە فەتوای سەلەفیزمی سعوودی , کە تەئویلاتیان بۆ کردووە و تۆش بۆمان کۆپی و پەیست دەکەیت . بەڵگە بهێنە کە بڵێ : فلاّن کەس لەو دوو چاخە زێڕینە حەرامی کردوون .

بەڕێزان, موسوڵمانی ئازیز و بۆ خودا سوڵحاو ، بێ ئەمەل مەبن ئەم ڕووداوانە , هەرهەمووی لە بەرژەوەندی خودا و ئاینی خودا دایە . خوێنەر بن هەتا کۆتای ئەو کات دەزانن چۆن خودا ئاینەکەی سەردەخات ؟ سەرکەوتنی خودا و ئاینی خودا زۆر نزیکە , بە تەنها ڕێکخستنی دەوێت و ئەو ڕێکخستنەش شەش ساڵی دەوێت .

( قَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَى اللَّهُ بُنْيَانَهُم مِّنَ الْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ )

پێشتر دەوڵەتی خلافەی ئیسلامی هەبوو کە بەرگریان دەکرد ، لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە کەس نەما کە بەرگری بکات . چاوی هەموو دنیاش لەسەر شوێنی وەحی و یەکەم دەسەڵاتی ئیسلامە کە مەککە و مەدینەیە .
(لۆرانس) شارەزای دەوڵەتی ئاینی کاثۆلیکە, یاسای بۆ داڕشتن هەتا ئاخر زەمان دەوڵەتی ئیسلامی دروست نەبێتەوە

یەکەم کاری ئەوە بوو کورسی پاپای فاتیکانی بۆ دانان . دین جیا بکرێتەوە لە دەوڵەت ، چونکە خۆیان بە سەدان ساڵ نالاَندویانە بەدەست حوکمی فاتیکانەوە . بۆیە هات هەمان کورسی پاپای لەناو ئیسلام دروست کرد ، ئەوەتا 100 ساڵە دەناڵێنین , بە دەست سەلەفیزمی لۆرانسیەوە .
هەرکەس بڵێت : سیکۆلاریزم و عەلمانی, داوای جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت دەکات . سفرە لە بواری فکر و مێژووی ئەوروپا و حوکمی کڵێساوە .
چونکە کاتێك حوکمی (ڕۆمی کاثۆلیك) نەما . (پرۆتستانت) جێگای گرتەوە و ئەویش هەر حوکمی دین بوو ، هەتا ئێستاش 90٪ی قوتابخانە سەرەتاییەکان لە ڕۆژئاوا , یان کاثۆلیکن یان پرۆتستانتن ، بەڵام پشکی شێر بەر پرۆتستانت کەوتووە . بۆیە خەڵکی ڕۆژئاوا زیاتر بە لای سیکۆلار و عەلمانیەت لا دەدەن .
چونکە پرۆتستانت ئاینیان بۆ دابین دەکات و لایەنی رۆحیان پڕ دەکاتەوە . لایەنی دنیایش ئازادن چیۤ دەکەن و ئاینەکە نابێت بەڕێگر لەبەردەم حەز و ئارەزووەکانیان دا .

(لۆرانس) کورسی پاپای سعودی جێگیر کرد ، بەوەی نابێت هیچ کەس باسی سیاسەت بکات . وە (پاپا) چی گوت حوکمی ئەو ڕاستە .

بگەڕێنەوە بۆ حوکمی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕستدا دەزانن باسی چی دەکەم ؟
ئەم کورسیەی پاپایان ناردە دەرەوەی سعودیە . لە هەموو وڵاتێکی بەناو ئیسلامی پاپایەکیان دروست کرد ..
وە ناویان نا (فلاَنی سەلەفی) .. ئەم پاپایانە هەرهەموویان کار لەسەر ئەوە دەکەن کە سیاسەت بڤەیە و نابێت موسولمان لێی نزیك بێتەوە ، هەرکەس لێی نزیك بووەوە لەلای (وەلی ئەمر) بیخەنە سجنەوە یان بیکوژن .
سیاسەتی ئیسلامیش ئەوەیە کە خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ دینی خودا و حوکم بە کتێبی خودا بکەن .
یەکەم سیکۆلار (محمدی کوڕی عبدالوهاب) و (سعود بن عبدالعزیز) بوون , کاریان لەسەر جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت کردووە . سەگ و گورگیشیان لە دەرەوەی سعودیە بلاَو کردووەتەوە و کار لەسەر سیکۆلار دەکەن .

پرسیار لە هەر سەلەفیەك بکەن و بڵێن : جائیزە حیزب دروست بکەین ؟
بزانە چیت وەلاَم دەدەنەوە ؟
کەواتا عەلمانی و سیکۆلار , کابرای سەلەفیە لە ڕێگای پاپاکانیەوە . حوکمی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا تەطبیق دەکەن بە ناوی (سەلەفی ساڵح)ەوە .

کاری دووەمی (لۆرانس) کە بۆ سەلەفیزمی دانا ببن بە (ارثذۆکس) وەك (کڵێسای شەرقی) بڵێن : ئەسڵی دین لای ئێمەیە . بەو شێوەیە ئاینی ئیسلام قۆرخ دەکەن بۆ خۆیان . خەڵکی عەوامیش شوێنیان دەکەون . وە بەم هەنگاوە هەزاران ئامانج دەپێکن .
هەر فتوایەك دەرکەن , خەڵکی لێیان وەردەگرێت چونکە ئەسڵی ئیسلام لای ئەوانە . بەم شێوەیە لای موسوڵمان و ناموسوڵمان ئەمان دەبن بە پێشەوا و پێشڕەو .
بۆیە دەبینن بناغەی دینی (لۆرانسیەکان) لەسەر (تکفیر و تبدیع و تهجیر) دامەزراوە هەرکەس سیکۆلار نەبێت و لەگەڵیان نەبێت. تەکفیر و تەبدیعی دەکەن و دەڵێن: لێی دووربکەونەوە خەڵکیش بە قسەیان دەکەن , چونکە ئەسڵی دین لای ئەمانە و لە سەر ئەرزی دابەزینی وەحی حوکم دەکەن .
بەم شێوەیە دەتوانن گرێنتی بدەن بە ئەمریکا , کە قەت هێزی سیاسی دروست نابێت و داوای حوکمی خودا بکات.
ئەم دوورە پەرێزیەیان بەس لە سیاسەتدا نیە , بەڵکو لە هەموو بوارەکاندایە .

(گاور و کڵێسا) بەسەدان کەناڵی کردووەتەوە و ڕەخنە لە هەموو پیتەکانی قورئان و ئیسلام دەگرن .
بەلام (پاپاکانی لۆرانس) دەڵێن : جائیز نییە بچنە ناویان و وەڵامیان بدەنەوە , عەقیدەتان تێك دەچێت .
بێدینەکان بەهەمان شێوە لە ئیسلام دەدەن . پاپاکانیان بە لۆرانسیەکان دەڵێن : جائیز نییە بچنە ناو کافرانەوە و وەڵامیان مەدەنەوە.

ئەم دوورە پەرێزیە وایکرد . کڵێساکان لە هەموو جێگایەك جێ پێیان هەبێت . لە ئیمارات گەورەترین (جالیەی مەسیحی) لێیە و جنسیەی ئیماراتیان داونەتێ و (پاپای فاتیکان) ئەم ساڵ سەردانی کردن ..
لە کاتێکدا (حەدیسی صحیح)مان هەیە, کە نابێت لە دوورگەی عەرەب (گاور و جوو)ی تێدا بێت .

بە ئامۆژگاری کردنی سەلەفیەکان , کە وەڵامی دژە ئیسلام نەدەنەوە . شەپۆلێکی گەورەی (ئیلحاد) لەناو موسولمانان بڵاو بووەوە . لە کاتێکدا سعودیە دەبووایە زۆرترین کەناڵی هەبووایە بۆ وەڵام دانەوەی دژەئیسلام لە هەموو بوارەکان

بێجگە لە بلاوبوونەوەی (بێ دینی) ، (ئال لۆرانس) گەورەترین گورزیان دا لە ئیسلام بە دروستکردنی (قورئانیەکان)
(ئال لۆرانس) جەخت لەوە دەکەنەوە کە ئەسڵی دین لای ئەوانە .
پێشتریش باسم کردووە : تەفسیرەکانمان و حەدیسەکانمان پڕن لە شتی نامۆ و بێ سەر و بەرە .

(ئال لۆرانس) 90٪ی دینەکەیان لەسەر حەدیس و تەفسیرەکان داناوە کە قسەی لەسەرە .
هەرکەسیش بڵێت وا نیە , تەکفیر و تەبدیع و تەهجیری دەکەن . هێندە خەڵکیان تەکفیر کرد . کار گەیشتە ئەوەی کە (قورئانی) باوەڕیان بە حەدیس نەمێنێت و هەروەها هەموو مێژووی ئیسلام ڕەت بکەنەوە .
تەنانەت قورئانەکەش بە ئارەزووی خۆیان تەفسیر بکەن و دان بەهیچ تەفسیرێکی ئیسلامی دانەنێن .

ئەوەی بووە هۆکاری دروستبوونی (قورئانی) .. (ئال لۆرانس) بوون . بەوەی هاتن دینێکی (لاهوتی)ان دانا و تەئویلیان دەکرد بۆ دینی ئیسلام بە ئارەزووی خۆیان .
سیلاحی سەرەکیان ڕیوایەتە لاوازەکانی تەفسیرەکان بوو , زائیدەن ئەو حەدیسانەی کاتی خۆی ڕیوایەت کراوە (مەبەستم بخاری و مسلم نیە) .. ئەو حەدیسانە کە نازانرێت ڕاستە یان نا ؟
دەمی خەڵکیان بەوە دادەخست ... دەیانگوت : (صححه الالباني) .

لە بەرامبەریشدا قورئانیەکان هەرهەموویان نەخوێندەوارن , بە تایبەت هەموو مامۆستا و خاوەن قەڵەمەکانیان . هیچیان ئەقڵی لێکۆڵینەوە و بەدوا داچوونیان نییە . .واتا کاتێك ڕەخنە دەگرن لەسەر ئایەتێك زۆر بە نەزانی و گەمژەیی ڕەخنە دەگرن . وەك باسم کرد : تەفسیری هەر ئایەتێك لە دوو ڕا هەتا چل و هەتا پەنجای تێدایە .

گەمژەیی و نەخوێندەواریە هەمووی ڕەت بکرێتەوە ، دەبووایە مامۆستایانی (قورئانی) کاریان لەسەر ئەوە بکردایە بۆ نموونە ئەم ئایەتە :
( وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَىٰ شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ )
(تەفسیری طبري) دەڵێت : 14 ڕای لەسەرە ..

(قورئانی) نەهاتووە دیراسە بکات لەم 14 ڕایە و , بڵێت : ئەوەندەی ڕاستە و لەگەڵ ئەسڵی دەقەکە هاو مانا و هاو ڕێبازە . بەم شێوەیە (قورئانی) دەیتوانی گەورەترین گورز لە سەلەفیزم بوەشێنێت .
بەڵام ئەحمقترین و نەخوێندەوارترین چینی موسوڵمان (قورئانیەکان)ن .

سەبارەت بەحەدیسیش بەهەمان شێوەن و خاوەنی هیچ دیراساتێك نین . قورئانی و سەلەفی هەردووکیان دوو ڕووی یەك دراون . هەردووکیان سەر لە موسوڵمان تێك دەدەن و بەرەو بێدینی دەبەن .
لەم بوارە دا شیعە زۆر ئاقڵتر و بە تواناترن .
(کمال الحیدری) شیعەیە لە (قوم) لە ئێران دادەنیشێت . خەریکی دیراساتی ئاینیە .
ئەم پیاوە ڕەخنە لە هەمو سەرچاوەکان دەگرێت شیعە و سونەش ... بە بەڵگەی کتێب و سەرچاوەکانی شیعە ئیسپاتی دەکات کە ئەو (ئیمام مەهدی)ەی شیعە باوەڕی پێی هەیە و بناغەی دینی شیعەی لەسەر دامەزراوە .
ئەو مەهدییە ئەسڵەن لە دایك نەبووە ... کەواتە شیعە چاوەڕوانی چیدەکەن و چۆن دەڵێن : (مهدي منتظر) دەردەکەوێت ؟

ئەم پیاوە لە (قوم) دادەنیشێت لەگەڵ ئەوەشدا حکومەتی ئێران نایگرێت !
ئەگەر زانایەك لە مەککە دیراسات لەسەر حەدیس و ڕیوایات بکات و بڵێت ئەمە و ئەوەیان ڕاست نییە.
حکومەتی (ئال لۆرانس) چیی لێدەکەن ؟
ئەی بۆچی (قورئانی) هێندە نەزانن و تا ئێستا یەك پیاویان تێدا هەڵنەکەوتووە کە دیراسە بکات ؟
هیچ نەبێ لەسەر سورەتی (الفاتحة) ... یان 500 حەدیسی دیراسە کرد بێت.... ئێستا دەزانن... بۆچێ ئێران بەهێزە ؟

هەتا 2019/5/30 , واتە پێش بەستنی (کۆمکاری عەرەب) لە مەککە ، هەموو دنیا وایان دەزانی شەڕی جیهانی سێیەم هەڵدەگیرسێت .. ڕۆژی کۆمکارەکە حەوت تەقینەوە لە (کەرکووك) ڕوویدا و حیزبێکی شیعی لە عێراق دژی ئەمریکا دروست بوو .

(ئەمر نامە) بوو بۆ سەرۆکەکان , کە ئاگادار بن وەك چۆن لە کەرکووك تەقینەوە کرا و حیزبی چەکدار دروستکرا . لای ئێوەش دروست دەکرێت .

وە هەموو سەرۆکەکان (عومرە)یان پێکرا . ئەمەش واتا سەرۆکەکان موسوڵمانن .

فرۆکەیەکی بێ فڕۆکەوانی (ئیماراتی) سەر بە هێزەکانی (حەفتەر) لە (لیبیا) خرایە خوارێ .
ئەمەش واتا (ئیمارات) مەسرەفی شەڕ و دروستبوونی (قاعیدە) لە (لیبیا) دەکات .

(حووسیەکان) بەڵێنیان دا بە ئسلوبی نوێ لە (ئیمارات و سعودیە) بدات .
ئەمەش واتە تەکنەلۆجیای تازە و بەهێزیان بەدەست گەیشتووە .

کۆتا هەواڵیش لە ئێرانەوەیە ...
(ڕۆحانی) سەرۆکی ئێران دەڵێت : هێزە ئەمریکیەکان 400 میل , واتە 643 کیلۆمەتر دوورن لە زەوی ئێرانەوە .
وە دەڵێت ئەمریکا پەشیمان بووەتەوە لە هەڕەشەکانی و ئێمەش باوەڕمان بە گفتوگۆ هەیە .

ئەمە هەواڵی ڕۆژی کۆتایی (کۆمکاری عەرەبی)ە .
(ئەمریکا و ئێران) ئامانجیان پێکا و ساحەی شەڕیان دروستکرد . لەمڕۆوە بە شەق خۆپیشاندانی (سودان) حەلدەکەن

ئەگەر هێزە ئەمریکیەکان 400 میل لە ئێران دوورن ، کەواتە بۆچی پێشتر کرا بە هەرا ؟
بۆچی ڕۆژی دوای (کۆمکار) ئەو هەواڵانە بڵاو دەکەنەوە ؟

کوردەی داماو بۆ خۆت بناڵێنە و ساحەی شەڕەکە دێتنە لای ئێمە و چاوەڕوانی شەڕەکەی (سلێمانی و شنگال) بن ..
وە (کاکە لاهور)م دوێنێ پێشەکی شەڕەکەی سلێمانیی ئیعلان کرد .

وەك پۆستم کرد :

((( ...... حکومەتی هەرێم نامێنێت پەرلەمانی کارتۆنی دروست دەکەن ... ئەمڕۆ 2019/6/1 یە و , سەرەتای جێبەجێ کردنی ئەو هەنگاوانەیە ... )))

لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/sardar.karem.714/videos/1253115548195917/?hc_location=ufi

پێش ئەوەی باسی جیاوازییەنێوان (سعودیە و ئێران) بکەین . دەبێت ئەوە بزانین ئەم دەوڵەتانەی (کەنداو و نیمچە جەزیرەی عەرەبی) , هەتا ساڵی (حەفتاکان) پێپەتی و ڕەش و ڕووت بوون , شوانی مەڕ و حوشتر بوون .

لە خێمە و چاردا دەژیان و دەگەڕان بە دوای لەوەڕدا ، لە ساڵانی 1939 وە نەوت لە سعوودیە دۆزراوەتەوە .
بەلام لە حەفتاکاندا بەرهەم و جۆری دەرهێنانەکان باش کرا و خەڵکی ناوچەکە پارەیان بینی و بووژانەوە .

کاتێك دەڵێن : سعودیە , واتا دەوڵەتەکانی تری چواردەوریشی (کویت و قطر و ئیمارات و عمان) .
چونکە زۆرترین ئاپۆڕا و خەڵك لە سعوودیە دەژین . ولاتانی تری نەوتی چوار دەوری سەرنشینیان کەمن .
بۆ هەموو کێشە دەرەکیەکان پشتیان بە سوپای سعوودی بەستووە .

هەر لە حەفتاکانیشدا (کۆماری ئیسلامی ئێران) دامەزرا و حکومەتێکی شیعەگەریان دروستکرد .

ئاینی (شیعیزم – شیعەگەری) هەناردەکرد بۆ دەرەوەی ئێران , بۆ ئەو ولاتانەی شیعەی تێدا نیشتەجێن ،
ئیتر گرینگ نییە ڕێژەیان زۆرە یان کەمە .
سەلەفیزم بەهەمان شێوە ئاینی (سەلەفیزم)ی ناردە دەرەوەی سعودیة .

شیعە زیاتر یارمەتی ئەو دەوڵەتانەی دەدا کە کێشەی مەزهەبی و شەڕی ناوخۆیان تێدایە ،
وەك ( لوبنان و یەمەن ) , وە لەگەڵ (سوریا)ش دۆست بوو .
لەو شوێنانە کە شەڕی تێدا بوو . (ئێران) ئاقڵ بوو یارمەتی شیعەکانی دەدا بەوەی فێری دەکردن چۆن چەك و تەقەمەنی سووك و قورس دروست بکەن , وە چۆن ئەو چەکانە بەکار بهێنن و لەشوێنی مەبەست بدات .

لەگەڵ ئەوەشدا لە ولاتانی تر کە شیعەیان تێدایە , پەیوەندیی دبلۆماسیی هەیە و لە ژێریشەوە لەگەڵ شیعەکان ڕێکە ئەگەر شەڕی تێکەوت ئێران دەتوانێت بە کەمترین ماوە هێزی چەکداری بەهێزی تێدا دروست بکات ،
وە خۆیان چەکی خۆیان دروست بکەن .

سەلەفیزمیش بەهەمان شێوە حەرەکەی سەلەفیان ناردە دەرەوەی سعودیة ، بۆ ئەو ولاتانەی دیکتاتۆرن و بەشوێن کورسی و دەسەلات کەوتوون .
وەك ( مصر و مغرب و لیبیا و تونس و ئوردن ) . ولاتانی تر وەك (عێراق) ئەسڵەن حسابی بۆ نەدەکردن ،
سەلەفیزم لە عێراق لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی 1991 دروست بوون . ئەویش (یەکێتی و پارتی) دروستیان کردن ,
بۆ بەرژەوەندی کورسی خۆیان .

ئەگینا (سەلەفی و سەلەفیزم) لە باشووری عێراق بوونی نییە . ئەم سەلەفیزمەی سعوودیة کاریان ئەوەیە .
جاسووسی بکەن بەسەر مزگەوت و ئیمامەکانیان و نوێژ خوێنەکاندا . هەرکەس قسە بکات دژی دەسەلات سیخوڕەکە بە گرتی دەدات . ئەگەر بزانرێت چەکدارن و دەیانەوێت هێزی چەکداری دروست بکەن .
کاکی سەلەفیزم .. سەرەتا خۆی و ژن و خوشك و دایك و کچی حیز دەکەن ئینجا بە ئیعدام کردنیان دەدەن .

بۆ ئەوەی هیچ کەس ئەو چەکدارانەی خۆش نەوێت و بە بێ شەرەف و حیز لەقەڵەمیان بدەن . کاری سەرەکی سەلەفیزم , سووککردنی هەرکەسێکە دژی دەسەلات و وەلی ئەمر بێت . هەروەها سووککردنی هەرکەسێك کە هاوڕای نەبێت , یان لەو مزگەوتەی ئەو نوێژ نەکات , یان هاوڕای مامۆستاکەی نەبێت .
ئەم سیخوڕ و جاسووسانە تەنانەت لەناو خۆشیاندا تەواو نین .

حکومەتی سعوودی یاسایەکی بۆ داناون . یەکێکیان دەکات بە سەرۆك و دەسەلاتی دەداتێ و پشتگیری دەکات بە پارە ، بە سەرۆکی ئەو دەوڵەتە یان ئەو حیزبەش دەڵێت پشتگیریی بکەن .
لە بەرامبەریشدا پشتگیری مامۆستاکانی تری سەلەفیش دەکات . بەلام پشکی شێر دەدات بە یەکێکیان .
باشترین نموونە کوردستانە . سەلەفیەکانی (پارتی و یەکێتی) زۆر لێك جیاوازن .

هەر مامۆستایەك و شوێنکەوتووانیان , لە مامۆستاکانی تر دەخوێنن . بەڵام هێز و دەسەلات لەلای یەك دانەیانە .
لەکاتی کێشەکان سەرگەورە هاتە پێشەوە دەسەلات بە قسەی ئەو دەکات .
مامۆستا بچووکە خوێڕیەکانیش خۆیان ئۆتۆماتیك بێدەنگ دەبن , سەیربکەن لە کوردستان (عبداللطیف سەلەفی) سەرۆك و سەرکردەیە . دەڵێت هیچ موچەم نیە پارەم نیە بۆ کەناڵەکەم .
کەواتا بۆچی و بەچی پارەیەك ساڵانە هەموو دەچێت بۆ حەج و عەمرە ، دیقەت بدەن هەموو ساڵێك کێشەیەك دروست دەبێت . (عبد اللطیف) لە (مەککە)وە قسە لەسەر کێشەکە دەکات و دوعا بۆ (وەلی ئەمر) دەکات و کورسی دەسەلات پیرۆزی ئاینی دەداتێ .

(سعودیة) ناتوانێت یەك فیشەك دروست بکات ، بەلام دەتوانێت لە ڕێگای سەگ و گورگەکانیەوە گەورەترین فیتنە و ئاژاوە دروست بکات .
(شیعە) دەتوانێت لە فیشەکێکەوە هەتا گەورەترین مووشەك دروست بکات . پێگەی شیعە بەهێز بکات لە هەموو جێگایەك کە شەڕی تێدا بێت .
سەرنجی ئەو جیاوازیە گەورەیە بدەن لە نێوان (شیعە و سەلەفیزم) دا !

شیعەی ئێران سیاسەتێکی ئاقڵ و حەکیمانەی هەیە و توانیویەتی ببێت بە مەرجەعی هەموو شیعە لە جیهاندا .
لەگەڵ (سیستانی) زۆر تەواو نین , لەگەڵ ئەوەشدا نایەن دژایەتی بکەن یان لایبەرن یان بیکوژن .
(کمال الحیدری) و چەند مەلایەکی تری بەناوبانگیان ڕەخنە لە کتێب و سەرچاوەکانیان دەگرن .
ئێران نایان گرێت و بیان کوژێت .
بەڵکو پارێزگاریشیان دەکات و مووچەشیان دەداتێ . ئێران حسابی ئەوە دەکات و سەیر دەکات کە چەند کەس دەگری بۆ حسێن !
لە بەرامبەر دا , چەند کەس خوێندەوارە , یان گوێگرە و گوێ بۆ (کمال الحیدری) دەگرێت ؟
کە دەبینێت 25 ملیۆن کەس بەپێ دەچن بۆ (چلەی حسێن) . پارە و بودجەی زیاتیش دەدات بە (کمال الحیدری) ، با هەر بۆخۆی بڵێت , ئەم 25 ملیۆن کەری ئامادەی هەیە , وە کەس گوێ لە فکر ناگرێت .

هەر لەناو شیعەدا خەڵکی ئیسلاحی هەیە ، شیعە نایەت بیانکوژێت و بیانگرێت . بەڵکو ڕێگایان پێدەدات و دەبن بە سەرۆك کۆمار . سەرۆك کۆمارێکی کارتۆنی ، چونکە دەسەلاتی گەورە لای (خامنئیە) , کەی بیەوێت لای دەبات ، گرنگیش ئەوەیە ئەو سەرۆك کۆمارە دوو دەورە واتا هەشت ساڵ تەواو دەکات و بە یاسایی لادەچێت , نەك بە کودەتا و کوشتن یان دەسەلاتی دینی لایبەرێت .

سعوودیە وڵاتی (تەوحید و لا اله الا الله) یە . بەلام کاری پەرتکە و زاڵبەیە لەناو خودی سەلەفیەکان دا و نەبووە بە مەرجەع تەنانەت بۆ ئاینەکەش .

(ئێرانی شیعیزم) و (سعوودیەی سەلەفیزم) .. هەردووکیان دژی ( الله و کتێبەکەی و سونەتەکەین) .
(ئێران) بە شێوەیەکی ئاقلانە و مەنهەجیانە توانیویەتی هەموو شیعەی جیهان لەژێر باڵیدا کۆ بکاتەوە .
(سعودیة) بە شێوەیەکی گەمژانە توانیویەتی تەفرەقە و دووبەرەکی و جەهل و نەزانی بلاو بکاتەوە , لەڕێگای سیخوڕەکانیەوە و وەلائیان بۆ وەلی ئەمر نەك بۆ خودا .

ڕۆژئاوا سەیری هێز دەکات .
بۆ نموونە کاتێك (ئەمریکا) عێراقی جێهێشت . (برێمەر) دەڵێت : من عێراق تەسلیمی کێ بکەم ؟
ئەگەر تەسلیمی (سونە)ی بکەم لەگەڵ کێدا قسە بکەم ؟
ئەگەر دوای دەرچوونم , کێشە دروست بوو .. کێ دەتوانێت حەلیان بکات ؟

هەر (برێمەر) دەڵێت : بۆیە تەسلیمی شیعەم کرد .. کارەکە ئاسانە سەفەرێکی نەجەفی دەوێت , و قسە لەگەڵ یەك کەس دەکەم , کە ئەویش (سیستانیە) .
ئەگەر دوای خۆشمان کێشە دروست ببێت بە یەك قسەی (سیستانی) کێشەکە نامێنێت .
هۆکاری گەورەی تەفرەقەی (سونە) , دەولەتی سعودیەیە و سیخوڕەکانیەتی لە جیهانی ئیسلامی دا .
لە کاتێکدا سعودیەش دەیتوانی ببێت بە مەرجع بۆ ئاینی ئیسلام بە حوکمی شوێنەکەی کە جێگای وەحییە و خاوەنی قیبلەی موسوڵمانانە .

بۆچی ناتوانێت ببێت بە مەرجەع ؟
چونکە لە سەرەتای دروست بوونیەوە ، گرێبەستیان هەیە لەگەڵ (لۆرانس العرب)دا . دەبێت هەتا ئاخر زەمان سعوودیە و دینەکەی , لە خزمەتی ئینگلیز و ئالای بەریتانی دا بێت . بۆیە دەبینین (سەلەفی) بە تەنها دەزانێت موسوڵمان سووك بکات , بچێت دەنگیان تەسجیل بکات و بلاوی بکاتەوە . سیخووڕی بکات بۆ دەزگاکانی هەواڵگری و ئاسایش .

ئەم خاڵە زۆر گرنگە :
" گرێبەستیان هەیە لەگەڵ (لۆرانس العرب) دا . دەبێت هەتا ئاخر زەمان سعوودیە و دینەکەی , لە خزمەتی ئینگلیز و ئالای بەریتانیدا بێت . "

( ئال سعوود ) گرێبەستیان هەیە هەتا ئاخر زەمان.. (لۆرانس) چووزانێت (ئاخر زەمان) هەیە و ئەسڵەن باوەڕیشی پێی نیە .

(سەردار)... تۆ تێك چوویت باسی ئاخر زەمان دەکەیت ؟... بەڵگەت چییە ؟

بەڵگەی من ئەوەیە :

پێش (جەنگی جیهانی یەکەم) ، دەوڵەت و دەسەلات و سوپا هەبوو , کە بەرگریان لە ئاینی خودا و قورئان دەکرد .

( تەتار و مەغۆل و خاچ پەرستان)یان بەزاند .

چەندین جار (شیعە) دەسەلاتیان گرتووەتە دەست . سوپای خیلافەتی ئیسلامی دەسەڵاتیان لە شیعە سەندووەتەوە .

ئەوە 100 ساڵە دەوڵەتی خیلافەت نەماوە . یەکەم هۆکاری ڕووخاندنی دەوڵەتی خیلافەت (ئال سعوود) بوون .

کە نیوەی (دەوڵەتی عوسمانی)ان لە دەوڵەتی خیلافەت سەندەوە و دایان بە دەست ئینگلیز .

تا ئێستا ئەم (سعوودیە)یە هیچ شتێکی باش و خێرداری نە کردووە لە بەرژەوەندی (قورئان و ئیسلام و موسوڵمانان) بێت , بەڵکو کاری جاسوسی و تەفرەقەیە .

ئێستا ئێمەی موسوڵمان لە ناخۆشترین قۆناغداین . هەزاران پارچەین ، کە هۆکاری سەرەکیی (ئال سعوود) و سەگ و گورگەکانیەتی .

بێ دەسەلاتترین ئومەتین . چەندین ساڵە لە (سوریا) , (شیعە و ڕووس و ئەمریکا) لێمان دەدات . وە لە باقی دەوڵەتەکانی تر دەسەلاتی زاڵمیان بۆ داناوین .

ئەوەتا ئەمریکا گەورەترین هێزی هێناوەتە ناوچەکەوە . لە بەرامبەردا (شیعە) میلی هێناوەتەوە . ناوجەرگەی شەڕەکە (ناوەڕاست و باکووری عێراقە) واتا بەشی (سوننە مەزهەب)ەکەیە .

پرسیاری سەرەکی ئەمەیە :

100 ساڵی ڕێکە زەلیلترین ئومەتین ، کێ بەرگریمان لێدەکات ؟

جاران دەسەڵاتی ئیسلامی هەبوو , کۆی دەکردینەوە لە سوپایەکدا و بەرەو ڕووی دوژمن دەبووینەوە .

ئێستا (ئال سعوود) , (قاعیدە و داعش) دروست دەکات بۆ ئەوەی زیاتر تۆپ و مووشەکمان پێوە نێن و لەناومانبەرن خۆشتان بینیتان چۆن لە (مەککە) دەوڵەتانی کۆکردەوە و چاوەڕوانی خراپترین کاریگەری بن لەم ساڵانەی داهاتوودا

کەواتا ئێستا ئاینێك هەیە ناوی (ئیسلام)ە لەناو دەچێت . ئەم ئاینە هیچ گەورە و سەرکردەیەکی نیە . وە چەك و خەڵکی دڵسۆزی نیە . دەڵێن : ئەم ئاینەش خاوەنی خودایەکە دەسەڵاتی زۆرە , وە خالقی زەوی و ئاسمانەکانە .

ئایا دەکرێت ئەم خودایەی خاوەن دەسەلاتە بێدەنگ بێت ؟.. ئایا ئەم خودایە چی پێدەکرێت ؟

بە غەزەب و هەورە تریشقە لە ناویان دەبات ؟

ئەگەر لەناویشی بردن , کێ لەناو دەبات و خەڵکی چوزانێت خودا ئەم کارەی کرد ؟

هەر زۆر بە ئاسانی دەڵێن : "ڕووداوێکی سروشتی بووە هۆی زەرەر و زیانێکی زۆر . "

کەواتە.. ئەم خودایە دەهێڵێت ئاینەکەی بەم شێوەیە لەناو بچێت ؟

کێشەکان لێرەدایە ..

100 ساڵە ئاینی ئیسلام بێ گەورەیە لەسەر زەوی . حوکمی خیلافە و ئاینی ئیسلامیان ڕووخاند ، هەر هەمان ئەو کەسانە (ئال سعوود)ن , زەلیل و بێ دەسەلاّتیان کردووین لە جیهاندا .
لە بەرامبەردا دەڵێن ئایا (شەڕی هەرمجدۆن – ملحمة الكبرى) هەڵدەگیرسێت ؟
بۆیە ئەمریکا ئەو هێزەی هێناوە , باوەڕی بەوە هەیە شەڕێکی گەورە بۆ خودا دەکەن و کڵێسا سەر دەکەوێت .
ناچمە باسی شەڕی هەرمجدۆنەوە ، خۆتان گەڕانی بۆ بکەن ..
خەڵکانێکی تریش هەن دەڵێن : (جەنگی جیهانی سێیەم) هەڵدەگیرسێت و مووشەکی ناوەکی بەکاردێت و دنیا خاپوور دەبێت و کەس نامێنێت .

منیش دەڵێم : هیچ لەو ڕووداوانە ڕوو نادات , چونکە ئێمە خاوەنی (قورئان و سونەت)ین .
ئاینەکەمان باسی نەکردووە کۆتایی دنیا بە شەڕی مووشەك تەواو دەبێت ، یان دەسەلاّتداران لە (هەرمجدۆن) بەرەنگاری یەکتر دەبنەوە و دنیا کۆتایی دێت .
بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) بۆی باس کردووین : کۆتایی دنیا ئەم (سەلەفیانەی سعوودیە)ن .

لە حەدیسی صحیحی موسلیمدا هاتوە دەفەرموێت :

( وأن ترى الحفاة، العراة، العالة، رعاء الشاء يتطاولون في البنيان .. )
واتە : خەڵکانێکی پێ پەتی ڕووت و ڕەجاڵی ( العالة ) واتە: بوون بە بار بەسەر خەڵکەوە ، ئەمانە شوانی لای مەڕ و حوشترن پارەیان نییە .
ئەم ڕووت و ڕەجاڵ و شوانە پێ پەتییانە دێن بینای بەرز بەرز دروست دەکەن . لە زۆر حەدیسی تریش هاتووە دەفەرموێت ئەمانە عەرەبن .

گرنگی ئەم حەدیسە لەوەدایە ، ئەم حەدیسە ڕاستەوخۆ جبریل (عليه سلام) بە پێغەمبەر (ﷺ)ی گوتووە .
وە خەڵكیش لە چوار دەوریان بووە و گوێیان لەو گفتوگۆیەی نێوان (جبريل و محمد) بووە (عليهما السلام) .
ئەمەش مانای ئەوەیە ئەم ڕووداوە دەبێت هەموو خەڵك بیزانێت و گوێی لێبێت . ئەگینا بۆچی جبريل (عليه سلام) لەشێوەی پیاوێك دێت بۆ مزگەوت و لەبەر چاوی خەڵکی پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکات ؟
ئەمە مانای وایە ئەو شتەی دەیەوێت پێی ڕابگەیەنێت (نهێنی و وەحی) نییە . بەڵکو شتێکی عامە و دەبێت هەموو کەس بیزانێت .

کەوات با ئێستا ئێمە شیکاری بۆ ئەو قسەیە بکەین بزانین ئایا مەبەست لە ئال سعودە یان نا ؟
سەرەتای حەدیسەکە دەفەرموێت
( وأن ترى الحفاة، العراة، العالة ... )
(وأن ترى) ، واتە : بزانرێت نەك (ببینرێت) , بزانرێت ئەم پێ پەتیە شوانانە ...
ئێستا با بگەڕێینەوە بۆ (قورئان) . { سوورەتی البقرة ئایەتی 126 } ... دەفەرمووێت :
( وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَىٰ عَذَابِ النَّارِ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ )

ئەمە دوعای سیدنا ئیبراهیمە (علیە سلام) بۆ (مەککە) و وڵاتی (نیمچە دوورگەی عەرەب) .
دەفەرمووێت : ئەم دەوڵەتە با جێگای ئاسایش بێت . ئەوانەی باوەڕیان بە خودا و ڕۆژی زیندوو بوونەوە هەیە ڕزقیان بدە لە بەروبووم .
ئێستا بگەڕێنەوە بۆ مێژوو , بزانن ئەو دوعایەی ابراهیم(علیە سلام) کەی خودا هێنایە دی ؟
هەتا زەمانی محمد (ﷺ) , ئەم ولاتە بیابان بووە و نەناسراو بووە , تەنانەت ڕۆم و فارسیش سوپایان نە ناردووە داگیری بکەن . چونکە بیابان بووە و هیچ بەرهەمێکی نەبووە .
زەمانی وەحی هەتا ئێستا دەکاتە 1400 ساڵ .

لەم 1400 ساڵەدا , ئەو ناوچانەی (کەنداو و نیمچە دوورگەی عەرەب) , هیچ بەرووبومێکی نەبووە .
لە ساڵی حەفتاکانەوە بە لێشاو نەوت هاتووەتە دەرەوە .
کەواتا دوعای ابراهیم (علیە سلام) لە ساڵی 1939وە هاتەدی و سەرەتای دۆزینەوەی نەوت بوو . بەلام لە ساڵانی حەفتاکاندا , ( وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ ) بەروبوومەکان هاتنە بەرهەم . ابراهیم (علیە سلام) دوعای بۆ ئەم کەسانە کردووە , (مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ) , هەرکەسێك ئیمانی بە خودا و بە ڕۆژی زیندوو بوونەوە هەبێت .

سەیری (ئال سعوود) بکەن , هەرکەس باوەڕی بە خودا و زیندوو بوونەوە هەبێت و هەوڵ بدات کە دەوڵەت بۆ ئەو دوو شتە کار بکات , سجنی دەکات .
سەیری (ئال سعوود و سەلەفیزم) بکەن . لەسەرەتای دروست بوونیانەوە خەنجەری ژەهراوین لە پشتی ئاینی ئیسلامدا ، هەوڵدەدەن موسوڵمانی سیخوڕ و جاسوس دروست بکەن , لەبری ئەوەی موسوڵمانی بە تەقوا و لە خودا ترس دروست بکەن .

دیقەتی حەدیسەکە بدەن ، دوای پێپەتیەکە زۆر دەقیق و وردەکارە دەفەرمووێت ( العالة ) واتا بوون بە بار ،
دیقەت بدەن لە زەمانی (خیلافەی عوسمانی)دا ئەمانە بووبوون بە بار بەسەر دەوڵەتەوە .
چەندین شۆڕشیان کرد هەتا (لۆرانس) دەستی گرتن و دەوڵەتی عوسمانی پێ ڕووخاندن .
لەو ڕۆژەشەوە کە دەوڵەتیان دروست کردووە , بوون بە بار بەسەر هەموو دنیاو و ئاینی ئیسلامەوە .

لە هەموو دنیا , (سعوودیە) بەپارێزگاری دین دادەنێن . چۆن دەتوانین لەو خەڵکە بگەیەنین ئەمانە دەمڕاستی ئێمە نین ؟.. لە ناو دەوڵەتە بە ناو ئیسلامیەکان حەرەکەی سەلەفیزمیان بڵاو کردووەتەوە . کە کاریان سیخوڕی و جاسوسیە بەسەر بانگخواز و خەڵکی عەوامەوە . کە دەقی ئایات و حەدیسەکان بە ئارەزووی خۆیان بەکار دەهێنن بۆ ئاینی (وەلی ئەمر) . ئەگەر کەسێکیش بڵێت : ئەو شیکاریە هەڵەیە (تەبدیع و تەفسیق و تەهجیر) و تەقحیب و تەحیزیشی دەکەن ..!

کۆتایی حەدیسەکە زۆر زۆر گرینگە , کە دەفەرمووێت :

( يتطاولون في البنيان )

(تطاول) ئەسڵەکەی دەچێتەوە بۆ (تفاعل) , واتە : کارتێکرنی شتێك لەسەر شتێك , یان لە شتێکی تردا .

ئەم وشەیە باس لە دروستکردنی بینای بەرز ناکات .

بەڵکو باسی (کاریگەری و کارتێکردن) دەکات بەو بینا بەرزانە . سەیری (دوبەی) بکەن ، چی کاری بەو بینا بەرزانە هەیە ؟.. بەو بینا بەرزانە چی کردووە و چی دەست کەوتووە ؟.. پێش ئەو بینا بەرزانە شوانی پێپەتی بوون .

پاش ئەو بینا بەرزانە ، ئاینی ئیسلامیان فرۆشت ، ولاتیان پڕ کرد لە (گاور) و ئیقامەیان پێدان . هەموو ئاینەکانی (هیند و سیخ و بودایزم) پەرستگایان بۆ کرایەوە . لە هەرجێگایەك شەڕ بێت و لە موسوڵمان بدرێت (ئیمارات و سعودیە) مەسرەفی شەڕەکان دەکەن بۆ نەهێشتنی موسوڵمان .

عەرەبی شوانی پێپەتی خۆی ئەو بینایانەی دروست نەکردووە و ئەقڵیشی پێ نەشکاوە کە دروستی بکات .

(ئەمریکا و ئینگلیز) پێیان دروست کردووە ، کاریگەری ئەوانە بۆ ئەو بینایانە . لە بەرامبەریشدا باجی ئەو بینایانە و کردنی ئیمارات بە گەورەترین جێگای گەشتیاری , لێدانی موسوڵمانە و نەهێشتنی ئاینی خودایە .

(تطاول) فەرقی هەیە لەگەڵ (بناء) , ئەم عەرەبە پێپەتیانە بینایان نەکردووە , بەڵکو (تطاول) و دەست درێژیان کردووەتە سەر ئاینی خودا .

کاریگەریی ئەو بینا بەرزانە و کردنیان بە دەوڵەتێکی گەشتیاریی گەورە ، هەر بۆ (ئەمریکا و ئینگلیز) خۆیان دەمێنێتەوە نەك بۆ عەرەبی پێپەتی .

سەیری سەرنشینی (ئیمارات و کوێت و قطر) بکەن , لە 50٪ و بەرەو سەرووی , عەرەب نین و خەڵکی ولاتانیترن . وە پەنجا ساڵی تر, ئەو 50٪ یەش نامێنێت. کەواتا کێ حوکمی ئەو دەوڵەتانە دەکات ؟.. (عەرەب و خەڵکە ئەسڵەکە نەماون , ئەو بینا بەرزانە بۆ کێ جێ دەمێنن ؟

ساحەی ئەم شەڕەی (ئێران و ئەمریکا)ش لەم 50 ساڵەی داهاتوو دایە . عەرەب زیاتر ناهێڵن و بە کوشتی دەدەن .

کەواتا ئەو بینا بەرزانە بۆ کێ دەمێنێتەوە ؟.. وە کێ حوکمی ناوچەکە دەگرێتە دەست ؟

ئایەتی 126ی البقرة , مەرجی ئیبراهیم (علیه سلام) بۆ ئەو ڕزقە ئەمەیە: (مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ) , دەبێت باوەڕیان بە خودا هەبێت ... ئایا (ئال سعوود) و شوێنکەوتووانیان باوەڕ بە { الله } دەکەن ؟
هەزاران کەناڵی tv , (شیعە و سوفیزم و قورئانی و مەسیحی و.. هتد ...) هەیە , شەو و ڕۆژ قورئان و الله و ئیسلام سووک دەکات ... چەند کەنالی سعوودی هەیە وەڵامیان بداتەوە ؟

ملیۆنەها (سایت و پەیج و ئەکاونت و کەناڵی یوتوب و.. هتد ...) هەیە , گاڵتە بە الله دەکەن , لە بەرامبەردا چەندی سعوودی هەیە وەڵامیان بداتەوە ؟
لە هەمان کاتدا ئەگەر کەناڵێك ڕەخنە لە (دەسەڵات و مەلیك و ئەمیرەکانی سعودی) بگرێت .
پاش سەعاتێك چەندان کەناڵ و سایت و پەیجی سعوودی , ئەو کەناله سووك و ڕیسوا دەکەن , کە ڕەخنەی لە وەلی ئەمر گرتووە !

لەسەر ئاستی مامۆستا و بانگخواز و شێخەکانیشیان ، چەند سەلەفی هەیە وەڵامی سووکایەتی بە { الله } بداتەوە ؟
ئەگەر باسی شێخێك یا مامۆستایەکیان بکەین ..
چەند پۆستت لەسەر دەکەن و خۆت و خوشك و دایك و ژن و کچت سووك و ڕیسوا دەکەن !؟
لە بەرامبەریشدا , چەند بانگخواز و مامۆستای سەلەفی هەیە , کە هەر یەکێکیان پسپۆڕ بن لەبوارێکی وەڵامدانەوەی دژە ئیسلامدا ؟

کەواتا ئەم سەلەفیانە شمولی دوعاکەی ابراهیم (علیه سلام) ناکەن , (مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللَّهِ) , وەك دەیانبینین ئیمانیان بە (وەلی ئەمر) و مامۆستاکانیان هەیە و بەرگری لەوان دەکەن , نەك لە { الله } .
کەواتا باوەڕیشیان بە بەشی دووەم و نیوەی دووەم نیە (وَالْيَوْمِ الْآخِرِ) , ئەگەر باوەڕیان بەو ئاخرە هەبووایە بەرگریان لە { الله } دەکرد.
خودای زانا و عالم الغیب وەڵامی ابراهیم (علیه سلام) دەداتەوە دەفەرمووێت :
( قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَىٰ عَذَابِ النَّارِ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ )

واتە : هەرکەسێکیان کفر بکات , (کفر) جۆری زۆر زۆرە , هێندە زۆرە لە ژماردن نایەت .
مانای کفر , واتا شاردنەوەی تۆو . بە (جووتیار) دەڵێن : کافر , چونکە تۆوەکە دەشارێتەوە .
لە ئیسلامیشدا بۆیە بەخەڵکی دژە ئیسلام دەڵێن (کافر) .
چونکە هەموو تۆوێك کە دەشاردرێتەوە گەورە دەبێت و بەرهەمی دەبێت .
هەموو کەسێکی کافریش شتی شاردراوەی زۆرە , کاتێك دەریان دەبڕێت بەرهەمەکە دژایەتی { الله } و ئاینە .

سەیری (ئال سعوود) و سەلەفیەکان بکەن , خۆیان شاردووەتەوە بەرامبەر ئەو هەموو سووکایەتیە بە { الله } .
بەڵام یەك قسە بە { الله }کەیان بڵێیت کە (وەلی ئەمر) و مامۆستاکانیانە . خۆیان ناشارنەوە و هەڵمەتی شێرانەت بۆ دەهێنن .
وە بۆ{ الله } کافر و شاردراوەن هیچ بەرهەمێکتان نیە و نایەنە مەیدان وەڵامی سووکایەتی بە دین و { الله } بدەنەوە.

تەواوکەری ئایەتەکە دەفەرموێت :

( فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَىٰ عَذَابِ النَّارِ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ )

( فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلًا ) واتە : خۆشی دەدەمێ , با لە خۆشیدا بژی ساتێکی کەم .

لێرەدا گرنگە باسی کات بکەین :.

سەیری (ئال سعوود) بکەن , لە حەفتاکانەوە لە خۆشی و پارە زۆریدا دەژین . 50 ساڵە لە خۆشیدان .

ئێمەی مرۆڤ سەبرمان نییە و دەمانەوێت هەموو شت بەخێرای بڕوات . بێ ئاگاین لەوەی ڕۆژێك لای خودا بەرامبەر بە هەزار ساڵی ئێمەیە :

( وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ ۚ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ) ﴿الحج : 47﴾

لای ئێمە ساڵی (2000)ە , بە حیسابی خودا 2 ڕۆژە .

کەواتە ئێستا تەصەوری ئەو 50 ساڵەی (ئال سعوود) بکەن . لەگەڵ ئایەتی ( فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلًا ) , پاش ئەو تۆزە خۆشییە دەفەرمووێت :

( ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَىٰ عَذَابِ النَّارِ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ )

دوای ئەو خۆشییە ( أَضْطَرُّهُ ) , (اضطرار) واتە : ئیجبارکردن بۆ کارێك , کە دەبێت هەر بیکەیت و هیچ چارەیەکت نییە و هەڵبژاردنت نییە و دەبێت ئەو شتە بکەیت .

واتا (ئال سعوود) و سەگ و گورگەکانی , ناچار دەکرێن بۆ عەزابی ئاگر و خراپترین چارەنووس .

وەك دەزانن 100 ساڵە (ئال سعوود و سەلەفیزم) خەریکی تێکدانی ئاینی ئیسلامن . هەزاران فەتوای حەڵاڵ و حەرامیان داناوە . کە هیچ کام لە زانایانی پێش خۆیان ئەو فتوایانەیان نەداوە .

واتە: قۆناغی (کاثۆلیك) و (ارتذۆکس)یان بە سەرکەوتوویی بڕیوە .

هەمووشتان دەبینن کە ئێستا (سعودیە) لە قۆناغی (پرۆتستانت)دایە . واتا (گۆڕانکاری و ڕیفۆڕم) .

بۆ ئەوەی ئاینی ئیسلام وەك ئاینی کڵێسای لێبێت و هیچ پیرۆزیەك نەمێنێت . دین هەبێت و خەڵکی ئازاد بن کە چۆن دینداری دەکەن و ئازادیی ڕەها هەبێت لە عیبادات دا .

ئەم (پرۆتستانت)ەش , لەسەر تەرمی (کاثۆلیك و ارتذۆکس) دەکرێت . واتا دەبێت دینە کۆنەکە ڕیسوا بکرێت و دینی نوێ بێتە ئاراوە . وە دەبێت دینە کۆنەکەش بمێنێت , بەلام بە ڕسوایی .

وەك چۆن تا ئێستا (پاپا) و (کورسی پاپا) ماوە .

ئەم کارەش زۆر زەحمەتە و (ئال سعوود) ناچنە ژێر باری . بۆیە (ئەمریکا) سەرەتا هات (یاسای سعودی) گۆڕی و (وەلی عهدی) کرد بە کوڕی مەلیك , نەك براکانی مەلیك . پاشان فەرمانی کرد هەموو شازادەکان بگرێت و سجنیان بکات . هەر بەو شازادانەی کە لە سجن بەربوون هات پلانی کوشتنی (جمال خاشخچی)ان دانا .

(سعودیە) هەر نەچووە ژێر باری ئەوەی ببێت بە (پرۆتستانت) بەو شێوەیەی کە ئەمریکا دەیەوێت .

(ترامپ) بە شێوازی خۆی پێیگوتن : "ئێوە بێ ئێمە هیچ نین و دەتان ڕووخێنین . " ... خۆتان دوو جار بینیتان داوای پارەی کرد و وتی : ئێمە نەتان پارێزین دەڕووخێن , بۆیە بە قسەمان بکەن .
(سعوودیە) پارەی دا و ئەمجارەش نەچووە ژێر باری ئەوەی دین بگۆڕێت .

کەواتە چاکترین شت شەقە و جولاندنی (کەشتی ابراهام لینکۆڵن)ە .. پاشان جوولاندنی ئێرانە .
ئێستا (ئال سعوود) هیچ هەڵبژاردنیان لەبەردەمدا نیە . لە باشوورەوە (ابراهام لینکۆڵن)ی لێیە .
لە ڕۆژهەڵاتەوە (ئێران)ی لێیە . لە (باکوور)ەوە (عێراق و حەشدی شەعبی) لێیە و سنووریان بە (سعودیە)وەیە و کەی بیانەوێت بە هەزاران (شیعەی حەشد) داخڵ دەکەن ، زائیدەن (حوسیەکان)یش لە باشوورەوە .
سەرەتا گوتم : ئەم شەڕە بۆ لاواز کردنی (سعودیە)یە و ئامانجی سەرەکی (سعودیە)یە نەك (ئێران) .

قۆناغی یەکەم سەرکەوتوو بوو و (کۆمکاری عەرەب) کرا و دەورەکان بەسەر دەوڵەتەکان دا دابەشکرا .
سەیری هەواڵ بکەن.. ئێران دەڵێت : هێزەکانی ئەمریکا لێمان دوورن ، هەردووکیان دەڵێن : ئامادەی گفتۆین .
بنتاگۆن دەڵێت : زۆرینەی پلانەکانی (ترامپ) جێبەجێ ناکەین .
ئەمانە مانای وایە (کۆمکاری عەرەب) بەگوێرەی پلانی داڕێژراوی ئەمریکا ڕۆیشتووە .

پێویست ناکات شەرە سەگ لەگەڵ (ئێران) بکرێت و هەتا (2019/12) ساحەی شەڕەکان ئامادە دەکرێت .
کە شەڕ دەستی پێکرد ... جارێکیتر شەڕە دەنووکی (ئەمریکا و ئێران) دێتەوە مەیدان .
کەواتە (سعودیە) ئیجبار کراوە ئاین بگۆڕێت , وە ئەم کارەش چەند ساڵێکی دەوێت . ئێستا بگەڕێوە بۆ ئایەتەکان.
چەندین ساڵە کفر دەکەن و بەرگری لە { الله } ناکەن . خوداش پشتیان تێدەکات و هەر بەهاوڕێ کۆنەکانیان ئیجباریان دەکات , کە بەدەستی خۆیان بەرەو دۆزەخ بڕۆن .

100 ساڵە دین و فەتوا دەفرۆشن و بەرگری لە { الله } و دینەکەی ناکەن .
ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئەمانە ئابڕوویان بچێت .. لەناو موسولمانان بناسرێن . هەر بەدەستی خۆیان فەتواکان پووچەڵ بکەنەوە و ئەگەر نەیکەن دەیانڕووخێنن .

لێرەدا سەیری ئەم یاریە بکەن :
100 سالە دین دەفرۆشن , لەبەر کورسی (وەلی ئەمر و پاپاکان)یان لە ناوەوە و دەرەوە .
هەموو جیهان پشتگیریان دەکات ... ئێستا دەبێت ئەو دینە بگۆڕن و کورسیەکانیشیان لاواز دەکرێت .
وە ئەگەر بەقسەی ئەمریکا نەکەن , هەموو دنیاش دژیان دەبێت .

کاتێك ئێوە دەسەڵات و پارەتان هەیە ,{ الله } و دینەکەی دەفرۆشن .
{ الله } بە دۆستەکانتان ڕیسواتان دەکات و ... دەبێت بیسەلمێنن کە لە کوێدا هاتووە (گۆرانی) حەرامە و کێ پێش ئێوە حەرامی کردووە ؟ ئەی ئێستا چی دەڵێن ؟ کە خۆتان کۆنسێرت دەکەن لە مەککە و مەدینە ؟

لەسەر ئەو بابەتە نارۆم و لە کتێبی (هەباسە.. لە دیوەخان چ باسە ؟)(1) ڕوونم کردۆتەوە .. لاپەرە ( 10 تا 12 ) .

کەواتە قۆناغی لەمەودوا .. دەبێت ئاینی (سەلەفیزم) .. لە ڕەگ و ڕیشەوە بێتەدەر و ڕیسوا بکرێت لای موسوڵمان و نا موسوڵمان .

ئەم قۆناغە زۆر گرنگە و حەدیسی صحیحی لەسەرە :

( لا تقوم الساعة حتى تعود أرض العرب مروجا و أنهارا )

ئەم حەدیسە فرە لایەنە ، من ئەو لایەنانەی باس دەکەم لەگەڵ باسەکە دەڕوات .

یەکەم : (لا تقوم الساعة) ، یەکێك نیە لە نیشانەکانی ئاخر زەمان ..

سەیری نیشانەکان بکەن دەفەرموێت : ( من علامات الساعة... ) واتە: ئەوە نیشانەیە و چاوەڕوانی نیشانەی تر بکەن .

بەلام لەم حەدیسەدا بە ( لا تقوم الساعة ) دەست پێدەکات . ئەمە نیشانە نیە , بەڵکو مەرجە و هاتووەتە دی و ئێمە لەو زەمانە داین , وە مەجالی تەئویل و پێچ و پەنای نییە .

مەرجەکەش هەمووان دەیبینین (باران و بەفر و تەرزە و سەوزایی و مێرگ) لە سعوودیە پەیدا بووە .

پرسیاری گرنگ ئەمەیە :

بۆچی ئەم مەرجە و ئەم بەڵگەیە دەبێت لە زەویی عەرەب بێت ؟

بۆچی حەدیسی بینا بەرزەکانیش هەر لە زەویی عەرەب بێت ؟

وەڵام :

( وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَىٰ عَذَابِ النَّارِ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ) ﴿البقرة: ١٢٦﴾

ئەم نیشانەیە بەڵگەیە بۆ کفر و فەسادی (ئال سعوود و سەلەفیزم) . وە دەبێت ئەمانە نەمێنن یان زۆر بێهێز بکرێن پێش هاتنی (ئیمامی مەهدی) ... ئەمە زەمینە سازیە بۆ هاتنی ( ئیمام مەهدی ) ...

---

(هەباسە.. لە دیوەخان چ باسە ؟)[1] : لینکی کتێب :

https://drive.google.com/file/d/1AxkVphL5UgJ9SSAzQs9yVBYnxmsjbzjK/view?fbclid=IwAR37Rvkns4HPdcjsI5ERAQDpolFfj-mHfQxjGZDUgUwHhY6tXkVHuPZ1dLc

لە سەرەتا دا گوتم : ئەم شەڕەی (ئەمریکا و ئێران) , بۆ لاوازکردنی ئیسلام و سعودیەیە .
واتە : دەرخستنی ئاینی ڕاستی { الله }یە , چونکە هەموو خەڵك وا دەزانن دینی ڕاست لای (سعودیە)یە .

ئەو دینەی 70٪ی باسی ئافرەتە و ئافرەتیان وا سووك کردووە . کە (تەتار و مەغۆلیش) وا بە کۆیلەیی بە سووکی سەیری ئافرەتیان نەکردووە .
سەیر بکەن ئێستا ... چۆن فەتوای (نیقاب و برۆ و چوونە دەرەوە و.. هتد ...)ی ئافرەت پووچەڵ دەکەنەوە .
کە ئەمەش گەورەترین خێر و سەرکەوتنە بۆ ئیسلامی مەزن .

هەڵوەشاندنەوەی ئاین لە لایەن (ئال سعوود)ەوە ، گەورەترین سوودی هەیە بۆ ئیسلام و فرە لایەنە ،
چونکە ئێستا زۆربەی موسوڵمان نازانێت کام مامۆستا و کام بانگخوز ڕاست دەکات ؟
هەرهەمووشیان لەسەر یەك حەدیس یان یەك ئایەت قسە دەکەن .
هۆکاری سەرەکی ئەم سەر لێتێکدانە ، ئاینی (سەلەفیزمی لۆرانس)ە . ڕێگای نەداوە بە هیچ کەس کە لێکۆڵینەوە بکات لە ئایندا ..
فیرعەونی وەلی ئەمر (مەلیکی سعودیە) , و فیرعەونە بچووکەکان (مامۆستا ئاینیەکان)ی حوکمی دەڵێن :

( أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلَى ) .... ( مَا أُرِيكُمْ إِلَّا مَا أَرَىٰ وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ ) ....
هەموومان ئەم خوایەتیەی (سەلەفیزم)مان بینیوە . لە مەلیکەوە هەتا مامۆستا و ئەندامەکانیشیان ، لە بواری ئاین دا بەس تەنها خۆیان بە ڕاست دەزانن و هیچ کەس بە ڕاست نازانن و دەبێت ئێمەش وەك ئەوان بین .
ئەگەر وەك ئەوان نەبین دۆزەخیین . وە دەبێت (صراط المستقيم) لەوانەوە وەربگرین .

سەر لێشێوانی موسڵمان هۆکاری ئەوەیە , کە دەبێت هەموو دنیا ئاین لە دیدی ئەوان وەرگرێت . پێچەوانە بیت یان دەتکوژن یان سجن دەکرێیت یان سووك دەکرێیت .
موسوڵمانی ئاسایی سەری لێ تێك چووە و نازانێت کێ راست دەکات ؟
لەم چوار بۆ شەش ساڵەی ئایندە دا ، خەڵکەکە هێندەی تر زیاتر سەریان لێ تێك دەچێت . چونکە لەمەودوا (سەلەفیزمی وەلی ئەمر) بە شەقی ئەمریکا ... دەبێت فەتوا کۆنەکان پووچەڵ بکەنەوە .
کارەکانیش زۆر بە خێرای دەڕوات ، (وسیم یوسفی مەدخەلی).. لە (ئیمارات) ڕۆژی دوای (کۆمکاری عەرەبی) دەستی پێکرد و هێرش دەکاتە سەر حەدیسەکان .

سوودی ئەم شەڕە سەگە و ئەم ئاین گۆڕینە بەناوی تازەگەری و گۆرانکاری ئەوەیە :
(خەڵکی گێل و نەزان), یان دەبێتە بێدین یان دەچێتە پاڵ لایەنێك لە لایەنی ئاینی یا دنیاییەکان و شەڕی پێدەکەن (خەڵکی زیرەك و شارەزا) , ئەسڵی دینەکە دەدۆزێتەوە , کە ئەمانە زۆر کەمن و لە 1000 دا 1 کەس هەیە بتوانێت خۆی بدۆزێتەوە .

لەم ناوەندەدا (دژە ئیسلام) قازانجی گەورە دەکات . دینی ئیسلامت بۆ دەکەن بە پووش , سووکی دەکەن و پەڕ و باڵی پێوە ناهێڵن . وە زۆرترین موسوڵمان بە لای خۆیاندا ڕادەکێشن . ئیتر هەریەکە بەگوێرەی ئاستی ڕۆشنبیری دەبێت بە بێدین یان قورئانی یان زەردەشتی یان .. هتد...

ئەم شەڕە سەگانە لە بەرژەوەندی (شیعە و ئەمریکا) دایە . چونکە ئەوان هەوڵ دەدەن . ئاینی (ئیسلام) نەهێڵن و ئاینی (شیعە) بێتە جێگای .

پلانەکەش زۆر قورس و گران نیە. 100 ساڵە (سەلەفی لۆرانسی) فەتوا و حەلاڵ و حەرام بە (ئال سعود) دەردەکەن . ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە پێیان پووچەڵ بکەنەوە .

بەم هەنگاوەش ئاینی ئیسلام تێك دەچێت وەك باسمان کرد .

زائیدەن.. ئاینی (شیعە) ڕەواجی زیاتری دەبێت ، هەروەها ئیماندارانی شیعە ئەو پەشیمان بوونەوانەی (ئال سعوود) و واز هێنانیان لە فەتوا کۆنەکانیان دەکەن بە خاڵی بەهێز بۆ خۆیان , کە (شیعە) ڕاست و دروستە و ئاینی خودایە .

ئەوەتا ئاینی (وەهابی) لە هەموو شت پەشیمان بووەوە و 100 ساڵە دەڵێن : فلاّن شت حەرامە ... کەچی ئێستا حەلاڵیان کردووە !

(گروپە جیهادیەکان) پشکی شێریان دەبێت لە ناشیرین کردنی دینی خودا .

بە هەزاران کەس بێ ئیمان دەبن کاتێك ڕەفتارەکانیان دەبینن کە چەندە قێزەونە . چونکە هەمووی بە ناوی ئایەت و حەدیس و خوداوە دەکەن .

ئەم ڕووداوانە هەرهەمووی زەمینە خۆشکەرە بۆ دەرکەوتنی (دەجال) . حەدیسێکی صحیح هەیە باسی دەرکەوتنی (دەجال) دەکات ، حەدیسەکە دوور و درێژە و بە تەنها ئەو بەشەی دادەنێم کە باسی (دەجال) دەکات دەفەرموێت :

( وبها يطلع قرن الشيطان )

خەڵکی ئەم حەدیسە شیکار دەکەن و دەڵێن : لە (عێراق)ەوە (دەجال) دەردەچێت . لە سایتە عەرەبییەکانیش گەڕام هەرهەموویان کەوتوونەتە هەڵەوە . ئەوانیش دەڵێن لە عێراقەوە دەردەچێت .

(بە فەزڵی خودا) من یەکەم کەسم هەستم کردووە کە حەدیسەکە دەفەرمووێت: (( (و بها) نەك ( فيها , يا , منها ) يطلع قرن الشيطان ... ))

بۆ ئەوەی بزانین ( بها ) چیە ؟.. دەچینە خزمەتی قورئان ئایەتی { 28ی المطففين } دەفەرمووێت :

( عَيْنًا يَشْرَبُ ( بِهَا ) الْمُقَرَّبُونَ ) .. کانییەکە ئاوی لێ دەخۆنەوە ... هەرکەس زمانی عەرەبی بزانێت , بۆ خواردنەوەی ئاو لە کانی دەڵێن : ( يشرب – منها ) واتا لێی دەخۆنەوە ، یان ( يشرب – فيها ) واتا دەمی تێدەخەن و تێی دا دەخۆنەوە . بەلام لێرەدا دەفەرمووێت : ( يشرب – بها ) . واتا هۆکاری خواردنەوەکە . لەو کانیە ئەوەیە کە ئەو کەسانە نزیك بوون لە خوداوە ( المقربون )

لە دنیادا نزیك بوون لە خوداوە ، بۆیە ئەو کانیە تایبەتە بەوان, خەڵکیتر بۆی نیە لێی بخواتەوە .

لە ئایەتی { 6ی الانسان } دا هەمان شت باسی کانی دەکات لە بەهەشتدا و دەفەرمووێت :

( عَيْنًا يَشْرَبُ ( بِهَا ) عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا )

ئەم کانیەش بەهەمان شێوە بە ( **یشرب – بها** ) هاتووە ، بۆ هەموو کەسێکە ئەهلی بەهەشت بێت . هۆکارەکەش ئەوەیە کانیەکە وجودی نیە . ئەو کەسە لە هەر جێگایەك تینووی بوو کانیەك بۆ خۆی دەتەقێتەوە و ئاو دەردێت و ئاو دەخواتەوە .

یان کاتێك موسا (علیه سلام) باسی گۆچانەکەی دەکات , بە خودا دەفەرموێت :

( قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ ( بِهَا ) عَلَى غَنَمِي )

دەڵێت : مەڕەکانم دەجوڵێنم و بە ئاڕاستەکاندا دەیانبەم . بە هۆی گۆچانەکەمەوە . ( **وأهش – بها** )

ئەم حەدیسەی دەرکەوتنی (دەجال) لە (عێراق).. 10 ساڵ زیاترە من بیری لێدەکەمەوە !

لام سەیربوو بۆچی و چۆن خودا کەسێك خلق دەکات هەموو دەسەڵاتێکی خودایی دەداتێ و کارەکانی خودا دەکات, مردوو زیندوو دەکاتەوە و باران دەبارێنێت.. هتد ...

کەواتە ڕۆژی قیامەت نابێت خودا محاسەبەی ئەم دەجالە بکات ، چونکە دەجال خۆی ئەو دەسەڵاتانەی نیە و تاوانیشی نیە خاوەنی ئەو دەسەڵاتانەیە . وە ئەگەر خوداش محاسەبەی نەکات . کەواتا (عەدلی خودا) دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە ، کە دەجالێك دەنێرێت هەموو توانایەکی دەداتێ و من و تۆ پێی هەڵدەخەڵەتێین .

ڕۆژی قیامەت بە چی حەقێك خودا من و تۆ محاسەبە دەکات کە دوای دەجال کەوتوین ؟

بەلام چونکە خۆمان لە ڕووداوەکاندا دەژین . وەڵامی ئەو پرسیارانە زۆر ئاسانن ،

ئەمەش وایکرد ڕاستیەکی تر لەلام جێگیر بێت . ئەویش ئەوەیە ئێمە نازانین پێش خۆمان چی بووە و چی ڕوویداوە و خودای خاوەن دەسەڵات چۆن بەڵگەکانی بۆ خەڵکی بە ڕوونی داناوە ؟

ئێمە باوەڕمان هەیە کە خودا عەدلە و پەیامبەرانی ناردووە . بەڵام چۆنیەتیەکان و ڕووداوەکان نازانین .

ڕونتر دەڵێم :

1400 ساڵە خەڵکی باسی دەجال و فیتنەی دەجال دەکات . پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت : هەموو پێغەمبەرێك ئاماژەی بە فیتنەی دەجال داوە .

کەواتا لە زەمانی نوحەوە (علیه سلام) , خەڵکی دەزانن دەجال لە ئاخر زەماندا پەیدا دەبێت . پرسیاری زۆر دەربارەی کراوە و وروژاوە .

خۆشبەختیە کە ئێمە لەو زەمانەداین و وەزعەکان دەبینین . لە هەمان کاتیشدا ناخۆشییە کە دەکەوینە زەمانی فیتنەیەکی گەورەوە .

ئەم خۆشبەختی و ناخۆشیە لە حەدیسەکەی خۆشەویست (ﷺ) دا باسکراوە . کە باسی پەیدابوونی دەجال دەکات لە (ڕۆژهەلات) . دیقەت بدەن :

50 ساڵە لەهەواڵەکان باس باسی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستە .. وە من ئەمڕۆ لەگەڵ نوسینی ئەم بابەتە بیرم کەوتە پێغەمبەر(ﷺ) , هەمیشە ئاماژە بە دەجال و شەڕ و نەهامەتی دەدات بە ڕۆژهەلات .

خۆشمان 50 ساڵە ڕۆژانە دەبیستین و دەبینین شەڕ و پشێوی هەیە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست .
باشە بۆچی ئەقڵمان بۆ فیتنەی دەجال نەچوە ؟ هەرچی شەڕ و ئاژاوە و پشێویی دنیایە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستە .
ئێستا با بگەڕێینەوە بۆ لای حەدیسەکەی دەجال لە عێراق دەفەرموێت:

( بها يطلع قرن الشيطان )

( بها )مان باسکرد مانای چیە .. پاش ( بها ) دەفەرموویێت :
( يطلع ) بەمانای (هاتن یان دەرچوون) نایەت وەك خەڵکی دەڵێن : (دەجال) لە عێراق دەردەچێت .
بەڵکو (**طلع**) واتە : دەرکەوتنی شتێکی نادیار . بۆ نموونە : هەموو شەوێك تاریکە ، بەڵام هەموو کەسێك چاوەڕوان دەکات ئەو تاریکیە نەمێنێت و ڕۆژ هەڵدێت ، بە هەڵهاتنی ڕۆژ دەڵێن ( طلوع )
واتا ڕۆژ دەرناکەوێت و دەرناچێت . بەڵکو شاراوەیە و کاتێك دەردەکەوێت هەڵدێت .

کاتێك بە کەسێك دەڵێن : ( مطالەعە بکە یان مطالەعەت نیە ) . مەبەست لەوەیە ئەو کەسە شت نازانێت ، بەخوێندنەوە و بەدواداچوون, زانیاری پەیدا دەکات ،. زانیاریەکە وەك تاریکی شەوەکە بزرە . کەسەکە بە (مطالعة) واتا گەڕان و خوێندنەوە ئەو شتە بزرە دەبینێت , وەك چۆن بە ڕۆشنایی , (خۆر) طلوع دەکات و تاریکایی نامێنێت.
هەموو طلوعێك واتا ڕوودانی کارێك بە هێواشی و دەرچوونی شتێکی نادیار . شەو تاریکە و خەڵکی هیچ نابینن .
کاتێك خۆر هەڵدێت دەبینن چی ڕوویداوە .

ئێستا دێینە سەر ( قرن ) واتە : شاخ یان قۆچی ئاژەڵ .
هەر ئاژەڵێك شاخی هەبێت کەلە و سەری زۆر بەهێزە , وە ئەو قۆچە بەکار دەهێنێت بۆ بەرگری کردن لەخۆی .
شاخ واتا هێز و بەرگری .
( قرن ) بە مانای کاتیش دێت ، کاتێك دەڵێن قەرنێکە ئەو شتە ڕوویداوە یان قەرنێکە چاوەڕوانم . مەبەست لە ماوەی رابوردنی 100 ساڵە بەسەر شتێکدا .

هەر دەسەلاتێك کە 100 ساڵ حوکم بکات , ڕەگ و ڕیشە دادەکوتێت و بەهێز دەبێت وەك قۆچی ئاژەڵ بۆیە بە سەدەیەك یان سەد ساڵ دەڵێن : ( قرن ) چونکە وەك قۆچی ئاژەڵەکە پتەو و بەهێزە و توانای بەرگریی کردووە و ماوەتەوە و نەتوانراوە ئەو دەسەلاتە لاببردرێت .
حەدیسەکە باسی ئەو شاخە دەکات بە ( قرن الشيطان ) ناوی دەبات .
ئێستا وەك وشەکاری .. مانای حەدیسی ( بها تطلع قرن الشيطان )مان زانی .

حەدیسەکە باسی ئەوە دەکات پێغەمبەر (ﷺ) دوعا دەکات بۆ بەرەکەت بۆ ( شام و یەمەن و حیجاز ) ،
بەڵام دوعا ناکات بۆ (نجد) . چونکە جێگای شەڕ و فیتنەیە و (دەجال) لە ڕۆژهەلاتەوە دەردەچێت .
دوعا نەکردنی خۆشەویست (ﷺ) , مانای ئەوەیە بەرەکەت نەکەوێتە شوێنێك کە ببێت بە ناوجەرگەی فیتنە .

چونکە پەیامبەران هەمیشە دوعای چاك دەكەن نەك خراپ . مادام ئەو ناوچەیەش دەبێت بە ناوجەرگەی فیتنە , هەتا کەم بن و بێ بەرەکەت بن باشترە و فیتنەکە کەمترە .

دەرچونی (دەجال)یش لە ڕۆژهەڵاتە , ڕۆژهەڵاتیش ناوچەیەکی فراوانە ، ناتوانین بڵێین : فلان ولاتە ..
بەگوێرەی ئێمە لەو سەردەمی فیتنەیە دا دەژین ، کەواتا دەتوانین دڵنیا بین ( نجد ) مەبەستی لە (عێراق)ـە .
سەرنج بدەن هیچ بەرەکەتێکی نیە . لە (جەنگی جیهانی یەکەمەوە) کۆبۆن هەیە . هەر ولاتێك جەنگی تێ دەکەوێت لە کاتی جەنگ و پاش جەنگ , دەوڵەت (کۆبۆن) دەدات بە هاولاتیان بۆ وەرگرتنی ئازووقە .
پاش جەنگ بار و دۆخەکان هێور دەبێتەوە ، کۆبۆن نامێنێت . ئێستا سەیرکە 100 ساڵە عێراق (بایعی) وەردەگرێت . هەمو دڵمان پێی خۆشە و دەچین وەریدەگرین .. لە کاتێکدا (کۆبۆن یان بایعی) لە هەموو جیهان نەماوە تەنانەت لە (سۆماڵ) و ولاتە هەژارەکانیش .

کەچی لە ولاتی ئاڵتونی ڕەش و نەوت (عێراق) , تا ئێستاش ئێمە دڵمان بە بایعی خۆشە . ولاتی نەوتین و خۆمان نەوت و غازمان نیە ، کەس نازانێت داهاتی نەوت چی لێ دێت ؟..
(صدام حسین) هەمووی دەدا بە چەك و شەڕی پێ دەکرد ... دوای (صدام)یش خۆتان وەزعەکان دەبینن .
دەتوانین شوێنی ئەو حەدیسانە دیاری بکەین کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : لە ڕۆژهەڵاتەوە (دەجال) دەردەچێت . ئەویش (عێراق)ـە . بەڵگەی بەهێز بەشی کۆتایی حەدیسەکەیە : ( بها يطلع قرن الشيطان ) .

واتا بەهۆکاری ئەوەوە هێز و توانای شەیتان دەردەکەوێت . ئەمە کرۆکی یاری (ساحەی شەڕی ئەمریکا و ئێران)ـە .

دەبێت بزانین ئەو هۆکارانە چییە ؟
وەك پێشتر باسم کرد : هەتا (جەنگی جیهانی یەکەم) , دەوڵەتی ئیسلامی هەبووە و بەرگریان لە ئاینی خودا کردووە ( کەم و کوڕی هەبووە ) بەڵام ئەوانە هەمووی ناوخۆیی بوون و پاش ماوەیەك نەماون .
بەڵام ترسی ئەوە نەبووە ئاینی خودا لەناو بچێت ، ترسی ئەوە نەبووە دەوڵەتی (ڕۆم) یان (فارس) دروست بێتەوە و لەناومان بەرێت . هیچ زلهێزێك بە درێژایی 1300 ساڵ نەیتوانیوە و نەیوێراوە ببێت بە مایەی هەڕەشە بۆ نەمانی دینی خودا .

دوای (جەنگی جیهانی یەکەم) , بۆ ماوەی 100 ساڵە دەمڕاست و پارێزگاری ئیسلام لە دیدی هەموو دنیاوە (سعودیەیە) , کە خاوەنی ئاینی دروستکراوی (سەلەفی)ە . ئەم سەلەفیانە 100 ساڵە خەریکی تێکدانی ئاینن .
هیچ دەسەڵاتێکیان نیە هەتا هێزی دەرەکی لێیان بترسێت یان حسابیان بۆ بکات .
ئاینێکیان دروست کردووە بووە بە مایەی گاڵتەجاڕی موسوڵمان پێش ناموسوڵمان . ئێمە خۆمان موسوڵمانین ناتوانین لەگەڵ (سەلەفی) هاوڕا بین لە هیچ بابەتێك ، ئاینیان قۆرخ کردووە بۆ بەرژەوەندی (وەلی ئەمر) , لە ناوەوە و لە دەرەوەی (سعودیەی وەهابی لۆرانسی)ـەوە .
ئاینی ئیسلام لەناو موسوڵمان و لە دەرەوەش ناشیرین و بێ هێز بووە بە هۆکاری ئەمانەوە .

وەك خۆشتان دەبینن : ئێستا خەریکی ئەوەن چاکسازی بکەن لەناو سعودیە لە ئاینی ئیسلام دا . ئەمەش مانای ئەوەیە : فەتوا و حەلاڵ و حەرامی 100 ساڵەیان پووچەڵ بکەنەوە .

یەك نموونە باس دەکەم :.
دەیانگوت شۆفێری ئافرەت حەرامە ، بە سەدان ئایەت و حەدیس و کتێب و نامیلکەیان لەسەری دانابوو بە ناوی ئاینەوە .... ئێستا دەڵێن : شۆفێریی ئافرەت حەرام نییە !
کەواتە ئەو ئایەت و حەدیسانە چارەنووسیان چیە کە بۆ حەرامی دایان نابوو ؟
ئەمە گاڵتە کردنە بە خودا و قورئان و حەدیس . ئەم نموونەیە قیاس بکەن بۆ داهاتوو .. هەموو دینی ئیسلام و فەتوا حەرامە کۆنەکانیان دەبێت حەلاڵی بکەنەوە لەم ساڵانی داهاتوودا .
ئەمەش زەنگی ترسناکە ، واتا سووك کردنی خودا و ئاین و قورئان . زۆربەی هەرە زۆری موسوڵمانی عەوام , بەگشتی باوەڕیان بە ئاین نامێنێت .. 100 ساڵە دەڵێن : فلان شت حەرامە , کەچی بە ناوی چاکسازیەوە حەلاڵ دەکرێت .. 100 ساڵە دەڵێن فلان ڕووداو بەم شێوەیە بووە ، بەڵام ئێستا دەڵێن وا نەبووە .

پرسیاری سەرەکی ئەمەیە :
کێ ئەم تێکدانی ئاینە ڕادەگرێت بە ناوی ئیصلاحاتی سعودیەوە ؟..
کێ دەتوانێت بڵێت سعودیة درۆ دەکات و لە سەرەتاوە ڕاست نەبووە ؟..
کێ بەرگری لە ئاینی خودا دەکات و چۆن و بەچی دەتوانێت ئەم مەهزەلەیە ڕابگرێت ؟..
ئەمە یەکێکە لە هۆکارەکانی دەرکەوتنی (قۆچی شەیتان) . ئامانجی شەیتان ئەوەیە کەس دوای ئاینی خودا نەکەوێت وە دووربن لە خودا و ئاینەکانی .
سەیری مێژووی پەیامبەران بکەن . هەموو پەیامبەران نەیان توانیوە حوکم و دەسەڵاتیان هەبێت .
ئاینی ئیسلام تاکە ئاینە توانیویەتی 1400 ساڵ خاوەنی حوکم و دەسەڵات بێت .

ئەم خاڵە لە دوو لایەنەوە زۆر گرنگە :
**یەکەمیان** : ئەوەیە 1300 ساڵی پێش (ئال سعود) , شەیتان و مرۆڤیش نەیانتوانیوە ئەم ئاینە لەناو بەرن .
ئەم 100 ساڵەی کۆتایی , (ئال سعود) دینیان کردووە بە گاڵتەجاڕ و بەرەو لەناو بردنی دەبەن .

**دووەمیان** : ئەوەیە خودای خاوەن دەسەڵات بە درێژایی مێژوو حوکمی داوەتە دەست مرۆڤ ، خۆیان هەڵبژێرن شوێن خودا بکەون یان دنیا ؟.. ئەسڵی ئاینیش لای خودا , ئەوەیە کە بتوانن خۆیان بدۆزنەوە .
بۆ ئەوەی بە گوێرەی یاسا و ڕێساکانی خالقیان بژین . بۆیە دەبینین پەیامبەرانی پێش ئاینی قورئان هیچیان نەیان توانیوە وەك ئاینی ئیسلام دەسەلاتیان هەبێت .
خودای زانا لە ئاخر زەماندا ، دەسەڵاتی داوە بە ئاینەکەی بۆ ماوەی 1400 ساڵ حوکمی کردووە .

خودا خۆی زاناترە و خوێندنەوەی من بۆ دەسەڵاتی ئیسلامی لە کۆتایی زەمان بۆ ئەوەیە . ڕۆژی قیامەت حوجەی بێ باوەڕانی پێش ئیسلام ببڕێت .

خودا زانا عادله و خاوەنی عیلمی غەیبە ، ئەگەر بێ باوەڕان بڵێن خودایە حوکمێکی خودایی هەبوایە ئێمە شوێنی دەکەوتین ئێستا دۆزەخی نەدەبووین .

لێرەدا ئێمە شاهیدی هەموو ئومەتەکانین . ئەم ئایەتە مایەی سەربەرزیە بۆ ئێمەی موسوڵمان :

( وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ) .

شاهیدی هەموو ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەتین .

ئێستاش بەرەو کۆتایی زەمان دەچین . شاهیدین کە چۆن بێ باوەڕان ئاینێکی سەلەفیزمیان بۆ دروست کردووین ، سەرەتا بە ئارەزووی خۆیان یاریان بە ئاین و دەقەکان و حەدیسەکان کردووە بۆ ماوەی 100 ساڵ .

پاشان دێن ئەو ئایەت و فەتوایانە هەڵدەوەشێننەوە بەناوی چاکسازی و مافی مرۆڤەوە .

کاری شەیتان تەواو دەکەن بەوەی ئاین پووچەڵ دەکەنەوە . کەواتە ( بها يطلع قرن الشيطان ) .

هاتنی (دەجال) بۆ لەناوبردنی ئاینی ئیسلامە بە تەواوەتی . واتا ئەوەی (ئال سعود و سەلەفیەکان) دەیکەن , نیوەی کارەکانی شەیتانە ، چونکە کاتێك (دەجال) دەردەکەوێت کە خەڵکی باوەڕیان بە ئاین زۆر لاوازە .

لێرەدا (دەجال) دێت دەڵێت : من خودام . سەدا 50٪ ی کارەکانی (ئال سعود) تەواو دەکات و ئەو ( الله ) یەی کە قورئان باسی کردووە نامێنێت و ئەو ئاینەش نامێنێت .

پرسیارێکی گرنگ هەیە و دەڵێین :

(ئال سعود و سەلەفیزم) ئەم کارە دەکەن . بۆچی (عێراق) تێوە دەگلێت و بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) باسی (ڕۆژهەلات) دەکات ؟

وەلام :

دوژمنی سەرەکی ئاینی ئیسلام , (شیعە)یە , وە مەڵبەندی سەرەکییان لە (ڕۆژهەلات)ـە کە ئەویش (ئێران)ـە .

وە سەرچاوەی ئاینەکەیان لە (عێراق)ـە , کە ئەویش (کەربەلا و نەجەف)ـە .

لێرەدا هاوسەنگیەکان پێچەوانە دەبنەوە ..

1300 ساڵە (ئیسلام) هەیە , بەرگری لە قورئان دەکات .

1300 ساڵە (شیعە) هەیە , دژایەتی قورئان دەکات .

لەم 1300 ساڵە دا , نەیان هێشتووە ئاین بێ هێز بێت و (شیعە) بتوانێت دەسەڵاتی هەبێت .

کەواتە : ڕۆژهەلات (ئێران)ی تێدا نەبووە بە مانای شیعەیەکی بەهێز و بەتوانا .

وە عێراق , (کەربەلا و نەجەف)ـێکی وەك ئێستای تێدا نەبووە .

لەم 100 ساڵەی کۆتایی دا واتا دوای (جەنگی جیهانی یەکەم) , ئیسلامێکی بێهێزی بێ توانای (سەلەفیزم)مان هەیە .

کاریان بەرگری کردنە لە (وەلی ئەمر) .

(ئێران)ـێکی بەهێزیشمان هەیە , کە کاریان بەرگری کردنە لە گریان بۆ حسێن .

1300 ساڵیشە , (ناموسوڵمان) دەیەوێت ئاینی ئیسلام نەهێڵێت .

ئێستا ئەمریکایەکی بەهێز هەیە . کە پشتگیری ئیسلامێکت بۆ دەکات لەسەر بنەمای گریان بۆ (حسین) دامەزراوە .
ئەم دینە باوەڕیان بە (جیهاد و حوکمی خودا) نیە . ئەگەر حوکمی هەموو وڵاتە ئیسلامیەکانیش بکەن , بیر لەوە ناکەنەوە جیهاد بکەن و ئاینی خودا بڵاو بکەنەوە .

ئەوەی لایان گرنگە :

ساڵانە چەند کەس دەچن بۆ زیارەتی (حسین) ؟.. باوەڕیشیان وایە : کە حەج بۆ (کەربەلا) , لە حەجی (مەككە) ئەجری زیاترە .

ئەگەر (شیعە) دەسەڵاتی هەبێت . بەم شێوەیە گەورەترین شعائری خودا پەك دەخەن ، لەبری ئەوەی بچن بۆ (مەككە) دەچن بۆ (كربلاء) .

پێچەوانە بوونەوەی هاوسەنگیەکان , لێرە دایە :

ئاینی (سەلەفیزمی وەهابی) , بە 100 ساڵ ... ڕەنج و هەوڵی 1300 ساڵی پێش خۆیان پووچەڵ دەکەنەوە بە ناوی چاکسازی و ئیصلاح .

ئێستا کۆتایی ئاینی خودایە ، (ئال سعود) ناتوانن هیچ بکەن بەرامبەر ئێران و ئەمریکا . هیچ دەوڵەت و هێزێکی ئیسلامی نیە بەهێز بێت . لە کۆتایی دا ئەمریکا و ئێران سەردەکەون .

با ئێستا بیر بکەینەوە :

هەتا ساڵی 2070 ئاینی (شیعە) دەبێت بە جێگرەوەی ئاینی ئیسلام و قورئان , وە ئاینی ( الله ) بوونی نامێنێت .

ئەمە وەڵامی ئەو پرسیارەیە کە چەندین ساڵە بیری لێ دەکەمەوە :

خودا بۆچی (دەجال) دەنێرێت ؟..

(دەجال) تاوانی چیە خودا ئەو هەموو دەسەڵاتەی دەداتێ ؟..

ئایا لەو دنیا محاسەبە دەکرێت ؟..

گەر محاسەبە بکرێت تاوانی چیە خودا دەسەڵاتی داوەتێ ؟..

گەر محاسەبە نەکرێت ئەو خەڵکە تاوانیان چیە کە دوای دەکەون ؟..

( بها يطلع قرن الشيطان ) ..

وەڵامی هەموو پرسیارەکان دەداتەوە ...

پێشتر باسم کرد : 100 ساڵە خەریکی گۆڕینی ئاینن لە سعودیەوە .

ئێستا جارێکی تر ئەو فەتوایانە دەگۆڕن , بە ناوی چاکسازی و مافی مرۆڤەوە خەڵکی ئیمان لەدەست دەدەن .

لێرەدا دەبێت خاوەنی ئاینەکە بێتە وەڵام ، ئەویش خالقی کەونە . چونکە 100 ساڵە ئێمە زەلیل دەکرێین , وە خاوەنی هیچ هێز و دەسەلاتێك نیین .

ئێستا با بچین بۆ خزەت ( سورەتی القلم ) : ( فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا الْحَدِيثِ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ) .
خودای زانا دەفەرموویێت : ئەوانەی ئەم قورئانە بە درۆ دەخەنەوە لێیانگەڕێ بۆ من , واتا زاتی ( **الله** ) , با ئەوانە پلە بە پلە بەرز ببنەوە و خەریکی کاری خۆیان بن ..

سەیری (ئال سعود) بکەن 100 ساڵە خۆیان پاڵەوانی ساحەن و ئاینی ئیسلامی تەواوەتی لای ئەوانە و چی فیرقەی تری ئیسلامییە باطلن .
هەر کەسیش بڵێت : وا نییە .. سجن دەکرێت یان دەکوژرێت ، تەنانەت لە ئینتەرنێتیش شت بڵاو بکەیتەوە و بزانن خەڵکت لێ کۆدەبێتەوە , پارە دەدەن و سایتەکانت دادەخەن .

سەیری (ئەمریکا) بکە , 100 ساڵە بووە بە گەورەی سەر زەوی و یاسا بۆ هەموو جیهان دادەنێت .
سەیری (ئێران) بکەن زلهێزی بێ ڕکابەرە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و خاوەنی هەموو شتێکە ... ئەمانە وا دەزانن خۆیان خودا و گەورەی سەر زەوین ... پاشان دەفەرموویێت : ( وَأُمْلِي لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ) .
لێیان دەگەڕێم با بۆ خۆیان خۆیان بە گەورە بزانن . چونکە ( **کیدی متین** ) ,
( کید ) واتە : چارەسەرکردنی شتێك بە شێوەیەکی توند و تۆڵ . بۆیە کەید لە زمانی عەرەبی دا بۆ شتی باش و خراپیش دێت . هەر کەس ( کید ) بکات , زۆر بە توند و تۆڵی پلان دادەنێت و کەس نەزانێت چی دەکات .
خودای زانا ڕێگا دەدات بە مرۆڤ بە ئارەزووی خۆی پلان دابنێت بۆ دژایەتیی خودا و ئاینەکەی . لە کۆتایی دا خودا بە پلانێکی توند و تۆڵتر پلانی ئەوان پووچەڵ دەکاتەوە . چونکە دەسەلاتی خودا زۆر لە دەسەلاتی مرۆڤ گەورەترە , بۆیە گرینگ نیە لای خودا ئەوان چی دەکەن و پێیان دەفەرموویێت : ( وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ) .
واتە : ڕێگایان پێ دەدەم کارەکانیان بکەن و وابزانن ئەوان سەرکەوتوون . چونکە چارەسەرەکان لای منەوە ( واتە لای زاتی **الله** جل جلاله ) , لە پتەو , پتەو تره . با ئەوان بە ئارەزووی خۆیان پلان دانێن بۆ لەناوبردنی ئاینی (**الله**) .

ئێستا با سەیری وەزعەکان بکەین بە گوێرەی ( **بها يطلع قرن الشيطان** ) :
خەڵکی لە جیهاندا وا دەزانن کە (ئێران و ئەمریکا) شەڕ دەکەن . ئەم دوو هێزە شەڕ ناکەن , بەڵکو ئامانجیان لاواز کردنی (سعودیە)یە , لە هەموو لایەنێکەوە و پەشیمان بوونەوەی لە فەتواکانی بۆ ماوەی 100 ساڵ .
بەم شێوەیە ڕووی ڕاستیی (ئال سعود و سەلەفیزم) دەردەکەوێت بۆ موسوڵمانان و سەلەفیزم دەخرێتە زبڵدانەوە .
پاش لە زبڵنانی سەلەفیزم ، دەیانەوێت ئێران بکەن بە جێگری ئاین و موسوڵمانان .

لە بەری ئەوبەریش ئامادەکاری دەکرێت بۆ خورافەیەك کە 1100 ساڵە شیعە هەوڵی بۆ دەدات .
ئاینی (شیعە) لەسەر دەرکەوتنی (مهدي المنتظر) دامەزراوە . کوڕی (حسن العسکری)یە .
ئەم مەهدییە ساڵی 869 لەدایك بووە و ساڵی 874 یان 941 بزر بووە . بە حسابی شیعە لە ئاخر زەماندا دەگەڕێتەوە و دنیا هێور دەکاتەوە , پاش ئەوەی دنیا پڕ بووە لە جەور و زوڵم و ستەم .
واتا ئەم مەهدییە ئێستا تەمەنی 1150 ساڵە و هەر نەمردووە و (شیعە) چاوەڕوانی دەکەن دەربکەوێت .

پشێوییەکان ئێستا هەمووی لە (عێراق)دایە , لە (زاخۆ هەتا بصرة) خۆمان لەناو پشێویەکان دەژین . لە داهاتوو دا زیاتر و زیاتر دەبێت و سیناریۆی نوێ دێتە ئاراوە . دەسەڵاتی (عێراق) بە دەست (شیعە)وەیە , هەموو جۆرە شەڕەکان لە (عێراق) دروست دەبێت ، زیاتر شەڕی ئاینی هەڵدەگیرسێنن . بۆ ئەوەی خەڵکی لایەنی باوەڕ و بیرکردنەوەیان بەرامبەر بە خودا و ئاینی ئیسلام شلۆق بێت یان بەگومان بن .

الحمد لله من ئەقڵم بەوە شکا , کە لە ساڵی **2019** وە وەزعەکان بەرەو شلۆقی دەچێت . شەڕی فکر نامێنێت و گفتوگۆی هێمن نامێنێت .
شەڕەکان لە فەیسبووك و وەڵام دانەوەی گومان دەردەچێت . خۆتان دەبینن ڕووداو و کەناڵەکانی تر چیدەکەن ؟ لە داهاتوو دا خراپتریش دەکەن بۆ ئەوەی ئیمانی خەڵکی عەوام لاواز بکەن .

بۆیە لە **2019/1/1** دا , گروپی (فەرمو بۆ خزمەتی نیشتیمان)[1]ـم لە فەیسبووك داخست :

دەقی پۆستەکە :
(( گروپی (فەرمو بۆ خزمەتی نیشتیمان) داخرا ...
سوپاس بۆ خودا بۆ ماوەی **3** ساڵ زیاتر ئەم قوتابخانەیە خزمەتی زۆری کرد . سوپاس بۆ هەمووان لە یەکەم ڕۆژ هەتا کاتی داخستنی .............. لە ئێستا بە دواوە شەڕەکان لە فکر و مناقشە دەردەچێت . شەڕی چەك و جیهاد و قەومی و ئاینی و.. هتد ... دروست دەبێت . ئێمە دوور دەبین لەو شەڕ و فیتنانە بۆیە گروپ دادەخەین . بۆ ئەوەی نەبین بە مایەی کێشە و فیتنە و کوشتار . خەڵکی تر گروپ دەکاتەوە و شەڕە سەگی تێدا دەکات ئازادن .
قوتابخانەی (فەرمو بۆ خزمەتی نیشتیمان) جێگای مرۆڤە بە بێ جیاوازیی بیروڕا . کەسمان سەگ نین و بۆ هیچ کەس و لایەنێك ناوەڕین ... لەمەودوا ئێمەی مرۆڤ سەیری شەڕە سەگەکان دەکەین . ))

لینکی پۆستەکە : https://www.facebook.com/groups/1683635728590809/permalink/2252595318361511/

چونکە گروپ و ئەکاونتی شەخسی , ناتوانێت هیچ بکات بەرامبەر بە میدیاکان ئەمریکا و ئێران ئیدارەی دەدەن . ئەمانەش هەرهەمووی ئامادەکاریە بۆ دەرکەوتنی (دەجال) . فیتنەکان زۆر گەورەن .

خۆتان بینیتان لە (مانگی ڕەمەزان ـی **2019**) دا چەندین مەلای نەناسراویان هێنایە سەر شاشەکان . لە داهاتوو دا شتی سەیر و سەمەرەتر دەکەن کە شەیتانیش ئەقڵی پێ ناشکێت .

---

(فەرمو بۆ خزمەتی نیشتیمان)[1] : https://www.facebook.com/groups/1683635728590809/

( بها يطلع قرن الشيطان )

باسی (قرن)مان کرد واتا هێزو دەسەلات ، خۆشتان دەبینن هێز و دەسەلاتێکی زۆر بۆ ئەم 6 ساڵەی داهاتوو دانراوە (قرن) واتا سەدەیەك , سەدەیەك واتا ئەزموونێکی زۆر . شەیتان هەزاران قەرنە ئەزموونی هەیە لە گومڕاکردنی خەڵکی . ئەگەر سەیری سیاسەتی ئێستا بکەین . دەبینین ئەمریکا زۆر بێ پەردە و بە بێ مکیاج . ئەوەی بیەوێت دەیکات و دەیڵێت : بەرامبەر بە ئاینی ئیسلام , چونکە هیچ هێزێکی ئیسلامی نیە بەرپەرچی بداتەوە.

نیوەی زۆری خەرمانی کوردیان سوتاند ، کێ دەتوانێت ئەو کارە راگرێت ؟

هەر یەکەم ڕۆژی ( جەژنی ڕەمەزانی 2019 ) زۆر بێ منەتانە ئەم شوێنانەیان سوتاند , لە یەك کات و ساتدا :

- لە هەولێر : لە شوقەکانی ئیسکان ئاگر کەوتەوە ..
- لە سلێمانی : لە چیای ئەزمەڕ ..
- لە شارەزوور : لەناو قەیسەری و بازاڕی میوەفرۆشان ..
- لە ڕانیە : لای بازاڕی کۆنە نزیك نەخۆشخانەی گشتی ڕانیە ..
- لە گەرمیان : ئاگر بەردرایە دەغڵ و دانی گوندی جوامێر ئاغا و بە تە واوی سووتا ..
- لە شەنگال : 1250 دۆنم گەنم و جۆ سووتا ..
- لە هەورامان : ئاگر لە پووش و پاوەن و دەغڵ و دانی ناوچەکە , و سنووری هانەگەرمەڵە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەربوو ..
- لەبادینان : بەفڕۆکەی تورکی چیاکان دەسوتێندرێن ..
- لە چەمچەماڵ و بانی مەقامیش : ئاگر کەوتەوە ..

ئایا (دەجال و شەیتان) دەتوانن ئەم کارە بکەن ؟.. تا ئێستا بیستووتانە شەیتان هیچ شوێنێك بسوتێنێت و یاری بە ڕزق و ڕۆزی خەڵکی بکات ؟.. چاوەڕوان بن لە داهاتوودا شتی سەیرتر و جەرگبڕتر دەبینن و دەبیستن . (ئەمریکا و ئێران)ـیش ئەزموونیان هەیە لە تێکدانی ئاینی ئیسلام , بۆیە هەموو جۆرە شەڕێکی ئاینی دروست دەکەن

پێشتریش باسم کرد : ( بها يطلع قرن الشيطان ) ..

( بها ) واتە : بەو هۆکارانە هێز و دەسەلات و ئەزموونی شەیتان دەردەچێت . هێز و توانای شەیتانیش لای ئێمە شاردراوەیە ، پێشتر باسی مانای وشەی ( يطلع )م کردووە واتە : دەرچوونی شتێکی شاردراوە و نەزانراو .

لە 2019/1 وە تا ئێستا سەیربکەن چەند ڕووداوی سەیر و شاردراوە دەکرێت ؟.. لە بەرامبەریشدا سەیری ئەو هێز و دەسەلات و ئەزموونە بکە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانە , کە شەیتانیش ئەقڵی پێناشکێت .

کەواتا ئەم کارانە هەتا 2026 ئامادە باشییە بۆ دەرکەوتنی (دەجال) . حەدیسەکەش زۆر دەقیقە (دەجال) شاردراوەیە هێز و تواناکانی شاردراوەیە , بۆیە خۆشەویست (ﷺ) بە ( يطلع ) باسی کردووە , نەك (يخرج) .

بەلام قەدەری خودای تێدایە , کارەکانی (شەیتان) چیتر شاراوە نەبێت . بەرەو کۆتایی جیهان دەچین دەبێت شەیتان و کارەکانی دەرکەون .
لە ئێستاوە ئامادەکاری دەکرێت بۆ دەرچوونی . بۆ ئەوەی دەرکەوت نامۆ نەبێت لای خەڵکی . سەیری گەلانی موسوڵمان بکەن بێ دەسەلات و زەلیلن و بە هەموو شت رازین و ناتوانن بەرگری لە بچووکترین مافیان بکەن .
کەواتا کاتێك (دەجال واتا شەیتان) دەردەکەوێت ئەم گەلە زیاتر زەلیل دەکات .

لە کتێبی (ئاخر زەمان لە دیدی قورئان)[1] , باسم کردووە : دەجال , شەیتانە و کۆتایی ژیانیەتی لە کەون دا .
لێرە دا زۆرکەس دەڵێن : (دەجال) درۆیە و دەرناچێت و ئەسڵ و ئەساسی نییە .
منیش دەڵێم : بوون و نەبوونی (دەجال) بە بەڵگە دەسەلمێنرێت . من وەك ئیماندارێك بە ئاینی ئیسلامی مەزن دەڵێم : ئەگەر 100 ساڵ لەمەوبەر بیان گوتایە : دەجال و ئاخر زەمان ڕاست نیە , باوەڕم دەکرد .
چونکە : هیچ نیشانەیەکم پێ نەبوو وەك بەڵگە , وە ئەقڵیشم بەوە نەدەشکا کە چی ڕوودەدات ؟..
چونکە ئەوانە عیلمی غەیبن و بەس خودا خۆی دەزانێت .

بەلام ئێستا من و ئێوەش خۆمان لەناو ئەو زەمەنەدا دەژین . دوو بەڵگەی حاشا هەڵنەگرمان لەبەر دەست دایە , هەردووکیان حەدیسی صحیحن دەفەرموون : (من علامات الساعة ) , واتە : یەکێکە لە نیشانەکانی ئاخر زەمان .

ئەو دوو نیشانەیە :
**بەڵگەی یەکەمیان** : حەدیسی پێ پەتیە ڕەش و ڕووتەکانە کە بینای بەرز دروست دەکەن .
وە کاریگەریی ئەم بینا بەرزانە ئەوەیە دەبێت ببن بە کۆیلەی ئەمریکا و لە ئیسلام بدەن .
خۆشتان (سعودیە و ئیمارات) دەبینن چی دەکات بۆ لێدانی ئاینی ئیسلام ..

لە بەرامبەریشدا (ئێران)مان هەیە , سەیری بکەن چی دەکات ؟.. خۆتان بەراوردی زەلیلی (ئال سعود و ئال نهیان) بکەن بەرامبەر بە گەورەیی و دەسەلاتی (ئێران) .

لەم پۆستەی **2016/7/21** دا باسم کردووە :

(( بەراوردی خۆت بکە وەك تاك و وەك دەوڵەت , لەگەڵ (شیعە) دا !..
ئێمە گاڵتە بە ڕیوایەتەکانی شیعە دەکەین . لە بەرامبەردا (شیعە) لەسەر ڕیوایەتەکانیان کار دەکەن . بۆ نموونە :
ئەم ڕیوایەتە باسی فریشتەیەك دەکات بە ناوی ( فطرس ) باڵێکی شکاوە و لە ڕۆژی لە دایك بوونی (حسێن) دا لەگەڵ (جبریل)دا چووە بۆ لای (حسێن) و خۆی هەڵ سویوە لە بێشکەکەی (حسین) و باڵی چاك بووەتەوە و (جبریل)یش لایە لایەی بۆ (حسێن) کردووە ...
سەیری وێنەکان بکە ئێران فڕۆکەی دروست کردووە بەناوی (فطرس)ەوە . ئینجا بەراوردێکی خۆتی سونی وەك تاك بکە کاتێك دەبینیت دەوڵەتێك فڕۆکەیەك لەسەر بنەمای ڕیوایەتێکی خورافات دروست دەکات ...

لە بەرامبەر دا هەرهەموو دەوڵەتە بەناو ئیسلامیە سونیەکان توانای دروستکردنی هیچیان نییە و خەریکی ورگ زل کردن و بینای بەرز دروست کردنن , وە هەوڵیان بۆ ورگ و ناوگەڵیانە . لە بەرامبەریشدا ئێرانێکی بە حسابی ئێوەی خوراقات چی خەریکی دروستکردنی تەیارەی فطرس و دەبابەی صمـام و چەکی بەهێزی جۆرا و جۆرن , لەسەر بنەمای ڕیوایەتەکانی . من لێرەدا دەوەستم و خۆتان خۆتان بناسن و چاوەڕوان بن هەموو کەس شەقمان تێ هەڵبدا .

وە دەستخۆشی لە شەق وەشێنەکان دەکەم .. چونکە پارە و دەسەڵات و هێزمان لە دەستی دوژمانان دایە ( مەبەستم هەرهەموو دەوڵەتە بە ناو ئیسلامیەکانە ) , لەبەرامبەریشدا چونکە (ئێران) هێزی هەیە , هەموو دنیا حسابی بۆ دەکات وە تۆی سونەی گێلیش هەر گاڵتەیان پێ بکە و بە خۆتت نەزانیوە , تۆ خۆت گاڵتەجاڕیت بەهۆی سەرۆکەکانتانەوە

(مەلیکی سعودیە) تازە بە تازە خەریکی دروستکردنی باڵەخانەیە , کە لەوەی دوبەی بەرزتر بێت . ئەم عەرەبە پێ پەتیە ڕەش و ڕووتانە پارەیان بە دەستەوەیە بۆ منافەسەکردنی یەکتری لە بنیات نانی باڵەخانەی بەرزدا , کە یەکێکە لە نیشانەکانی ئاخر زەمان ( حفاة عراة يتطاولون في البنيان ) .. ))

لینکی پۆستەکە :

https://www.facebook.com/sardar.karem.714/videos/638815956292549/?fref=mentions

وێنەکان :




فڕۆکەی (فطرس) :



دەبابەی (صمصام) :



دەبابەی (ذوالفقار) :

**بەڵگەی دووەمیان** : هەر ( من علامات الساعة )یە ..
ئەویش گەڕانەوەی جەزیرەی عەرەبە بۆ مێرگ و کانی و ئاو و سەوزایی .

پرسیارەکە لێرە دایە :
بۆچی دووان لە نیشانەکانی ئاخر زەمان لە جەزیرەی عەرەب دایە ؟..
وەڵام : حەدیسی یەکەم , هۆکاری ڕوودانی حەدیسی دووەمە .

وەك دەبینن لەو دوو نیشانەیە لە پێشدا یەکەمیان هاتووەتە دی پاشان دووەم .
بەرز کردنەوەی ئەو باڵەخانانە بە بەلاش نیە ، لە بەرامبەردا دەبێت ئاینەکەیان بدۆڕێنن . کاتێکیش ئاین دۆڕا واتا : خودا بوونی نامێنێت (و العیاذ بالله) .

ئێستا خۆمان لەو زەمانەدا دەژین . ئەو دوو نیشانەیەمان بینیوە . دەبینین هێزێکی زۆر لە ناوچەکەدایە بە ناوی (شەڕی ئەمریکا و ئێران) . مەبەستی سەرەکی شەڕەکە لێدانی ئاینی ئیسلامە و لاواز کردنیەتی .
لەم 6 ساڵەی داهاتوو دا , دەبینن زەلیلترین و هیچترین میللەت و بیر و باوەڕ , ئاینی ئیسلام و موسوڵمان دەبێت .
وە بەهێزترین هێز لەسەر ڕووی زەوی (ئەمریکا و ئێران) دەبێت .

لێرەدا دینی خودا نامێنێت بۆ هەتا هەتایی . چونکە (ئێران) سەردەکەوێت و میدیا جیهانیەکان (شیعە) بە خاوەن و هەڵگری قورئان و ئیسلام دەناسێنن و دەیکەن بە هەڵگری ئاینی ( الله ) و ئیسلام .
لە یادیشت نەچێت ئەو دوو حەدیسە دەڵێن : لە نیشانەکانی ئاخر زەمانن . بەڵام ... ( بها یطلع قرن الشیطان )
نیشانە نیە , بەڵکو 100٪ دەرچوونی شەیتان و هێز و تواناکانیەتی . کەواتە ئێمە ئێستا لەو زەمانە داین و چاوەڕوانی ئەو دەرچوونە دەکەین .

چەند ساڵێکی تری داهاتوو دەبینین ، ئیسلامێکی توندڕەوی جیهادی بڵاو بووەتەوە . بە خراپترین شێوە کوشتار و کرداری ناشرین دەکەن بەناوی ( الله ) و قورئان و کتێب و سەرچاوەکانی ئاینی ئیسلامەوە .
ئەم گروپانە هەر یەکەیان سەر بە دەزگای هەواڵگری ولاتێکن . خەڵکی لە جیهان دا نەفرەت لە ئیسلام دەکات کە ئەم کارە قێزەونانە دەبینن . موسوڵمانیش نازانن کێ ڕاستە و کێ درۆیە ؟.. مەلا و فەتواچی جۆرا و جۆر پەیدا بووە کە هێندەی تر سەریان لە خەڵکی تێکداوە .

لە بەرامبەریش دا هێزێکی (شیعە)ی بەهێزی توند و تۆڵ هەیە . لای هەموو جیهان ناسراوە بەوەی مەزڵوومن و ئەمان شەڕی بەرگری دەکەن .
لەم ناوەندە دا خودا و ئاینی خودا لە ڕێگای قورئان و پەیامی (محمد)ەوە (ﷺ) لەناو دەچێت و نامێنێت.

کاتی جێبەجێکردنی ئەم ئایەتەیەی ( 32ی التوبة) یە . ئەمە ئیعجازێکی قورئانە لەم چەند ساڵەی داهاتوو دەیبینین ئەگەر نەمردین : ( یُرِیدُونَ أَن یُطْفِئُوا نُورَ اللَّـهِ بِأَفْوَاهِهِمْ یَٔبَاللَّـهُ إِلَّا أَن یُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ) .

1400 ساڵە ئەم ئایەتە دەخوێنین . تا ئێستا هیچ کاتێك وەك ئێستا هەوڵدراوە نوری خودا نەمێنێت ؟..

ئەم نورە بەچی نامێنێت ؟.. (بافواههم) , کۆیە تاکەکەی ( فوه )ە ، (فوه) واتە : کردنەوەی شتێك , مرۆڤ کاتێك قسە دەکات دەمی دەکاتەوە ، بۆیە بە قسەکردن دەڵێن ( فوه ) , خودای خاوەن دەسەلات لەم ئایەتە پێمان دەڵێت : ئەوانە دەیانەوێت بە قسە ئاینی خودا نەهێڵن ... لێرەدا دەبێت بزانین ئەو کەسانە کێن ؟..

دوو ئایەت بگەڕێینەوە دواوە دەفەرمووێت : ( وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّـهِ وَقَالَتِ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّـهِ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ يُضَاهِئُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ قَاتَلَهُمُ اللَّـهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ) ﴿30﴾ ..

جوولەکەکان دەڵێن : (عوزەیر) کوڕی خودایە .

گاورەکانیش دەڵێن : (مەسیح) کوڕی خودایە.

( ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ )

دیقەت بدەن لێرەدا وشەی ( قولهم ) هاتووە , پاشان ( بافواههم ) . (قولهم) واتا : قسەکانیان . (بافواههم) واتا : بە دەمیان ... لێرەدا دەپرسین : قسە بە دەم دەکرێت . کەواتا قسەکانیان بە دەمیان مانای چییە ؟..

جوانی و بەلاغەتی قورئان لێرەدایە !..

ئەو ئایەتە واتا قسەکانیان هیچ نیە و هەر دەم کردنەوەیە ، دەم بۆ خواردن و هاوار و ناڵە و زۆر شتی تریش دەکرێتەوە مەبەستی قورئان لێرەدا ئەوەیە :

لە کوردەواری خۆشماندا دەڵێن : فلان هەر دەمە ،. واتە هیچی پێ ناکرێت و قسەکانی هیچە . چونکە لە ئەسڵ دا خودا کوڕی نییە . لەوەش گرینگ تر لە کتێبەکانیان دا ئەو قسەیە بوونی نییە بە دەق .

ئەوەی ئەوان دەیلێن , هەر دەمە هیچ دەقێك و بەڵگەیەکیان نییە بۆ قسەکانیان .

ئایەتی دوای ئەو ڕوونی دەکاتەوە ئەو دەمە و ئەو قسانەیان لە (حیبر و قەشەکان)یان وەرگرتووە . قسەی ئەوانیش بە گوێرەی دەق نییە . چونکە ئەوان هەڵگری ئاینەکەن دەبێت بە دەق بیسەلمێنن (عوزەیر و مەسیح) کوڕی خودان

( اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّـهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَـٰهًا وَاحِدًا لَّا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ) ﴿31﴾ .

مەبەستی سەرەکی لێرە دایە :

کاتێك (دەجال) دەردەکەوێت , جوولەکە و گاوریش شوێنی دەکەون ..

جوو دەڵێت : (عوزەیرە) ... (گاور)یش دەڵێن : (مەسیحە) ... (شیعەش) دەڵێن : (مەهدی کوڕی حسن العسکرییە) .

کەواتە 1400 ساڵە دەیانەوێت نووری خودا نەهێڵن . لەم ماوەیەدا هەر دەم بووە و بە قسە بووە .

بەڵام ئێستا خۆمان لە واقیعەکە داین و چاوەڕوانی (دەجال)ین . ئیشەکە لە قسە دەردەچێت و دەبێت بە فعلی .

کەواتا دەبێت ( الله ) دەوری هەبێت و نەهێڵێت ئەم دینەی لەناو بچێت .

**بۆیە لە ئایەتی (33ی التوبة) دوای ( يُرِيدُونَ أَن يُطْفِئُوا نُورَ اللَّـهِ بِأَفْوَاهِهِمْ ) دەفەرموویێت :**
**( هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ ) ﴿33﴾ .**
**باسی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات ناردوویەتی بۆ ئەوەی ئاینی خودا ڕوون بکاتەوە و دیاری بکات . وە بەرزی بکاتەوە بەسەر هەموو ئاینەکان دا .. ئیعجازی ئەم ئایەتە لەم زەمانەی ئێمە دایە .**

**1400 ساڵ لەمەوبەر ئاینی ئیسلام لەسەر ئاینی قورەیش و جوو و گاور و ڕۆم و ئاگرپەرست بەرزتر بووەوە و تا ئێستاش بەردەوامە .**
**1400 ساڵە دەیانەوێت بە قسە ئەم ئاینی ئیسلامە ناشرین بکەن . بەڵام خودا بە بەرزی ئاینەکەی ڕاگرتووە و بەرزە بەسەر هەموو ئاینەکانی ترەوە .**
**ئێستا کار لە قسە دەرچووە ، هێزێکی زۆر لە ئارا دایە . (دەجال) ئەمڕۆ سبەی دەردەچێت . ئاینی خودا لاواز دەبێت بۆ ماوەیەکی کاتی .. بەلام ئاینی خودا هەر سەردەکەوێت ، ئیعجازی ئەم ئایەتە بەردەوامە :**
**( هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ ) .**

**لێرە دا (رسول) واتە نێردراوی خودا . پێغەمبەر (ﷺ) نێردراوی خودا بوو . (مەهدی)ش دێت هەر نێردراوی خودایە . لە کاتێکدا دێت ئاینی ئیسلام بەرەو نەمان دەچێت . جارێکی تر خودا دەسەڵات دەدات بە مەهدی , ئاینی ئیسلام سەر دەخات و بەرزی دەکاتەوە بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا .. مەسیحیش (علیه السلام) دادەبەزێت و ئاینی (جوولەکە و کڵێسا) پووچەڵ دەکاتەوە .**
**لەسەر ئەم باسەی مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) نارۆم و لە کتێبی (ئاخر زەمان لە دیدی قورئان)[1] بخوێننەوە هەموویم باس کردووە ..**

**ئەم ڕووداوانەی تا ئێستا باسم کردووە ، خەڵکی وا دەزانن بە زیانی ئاینی ئیسلام دەشکێتەوە .**
**هۆکاری سەرەکیش ئەوەیە نەشارەزان لە ئاینەکانی خودا لە نوحەوە هەتا محمد (علیهم السلام) . دواتر دێمە سەر باسی کرۆکی ئاینەکانی خودا .**

**بەڵام ئەم ڕووداوانەی کە دێت ، یەکەم سوودیان ئەوەیە ئاینی خودا دەگێڕێتەوە سەر ئەسڵەکەی , واتا بۆ ئەو کاتەی ئادەم و حەوا و منداڵەکانی (علیهم السلام) لەسەر زەوی بوون . چونکە یەکەم تاوان ئادەم و حەوا کردیان (علیهما السلام) ، ئەویش سەرپێچی فەرمانی خودا بوو .**

---

**لینکی کتێبی (ئاخر زەمان لە دیدی قورئان)[1] :**

https://drive.google.com/file/d/1QdqZk_E6DcRZYpgp3vgScrHFYws_S1_g/view?fbclid=IwAR2KNSVnYF-m-a_hDColzPVgLy9K9STWNSSkU3QGa1MdHEu-i7wdve07r1o

ئەسڵی خەلق لای خودا ئەمەیە :

( فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰ ) .

خودای زانا فەرمان دەدات و مرۆڤیش دەبێت گوێڕایەڵی ئەو فەرمانە بێت . مرۆڤ ئازادە شوێن فەرمانەکانی دەکەوێت یان نا .. هیچ دەقێك نییە بڵێت : ئیجبارە ئەو شتە بکەن ، یان ئیجبارە نەیکەن . بەڵکو شەرعی خودا لە ڕێگای قورئانەوە داندراوە و فەرمانی تێدایە بە کردن و نەکردن . بەڵام ئیجبارکردنی تێدا نییە .

قورئانیش واتە : کۆکراوەی پەیامی هەموو پەیامبەران (علیهم السلام) . جاران خوێندەواری نەبووە ، بە شێوەی زارەکی (شفهي) پەیامەکەیان گەیاندووە . خودای زانا دەزانێت ڕۆژێك دێت مرۆڤ زیاد دەکات .
خوێندەوار زۆر دەبێت . بۆیە کۆتا پەیامی بە کتێب و بە نووسین ناردووە , کە ئەویش قورئانە .
کێشەی مرۆڤ بۆ شوێنکەوتنی خودا ئەوەیە خۆی لە شك و گومان لادات . سەرەتای ئەم گومانەش لێرە دایە :
( فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰ ) .

مرۆڤ تاوان دەکات , تاوانەکانیش هۆکارەکەی دیاری کراوە (وەسوەسە)ی شەیتانە . کاتێك یەکەم مرۆڤ تاوانی کرد , گوتیان : ( قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ) .
سەرچاوەی زوڵم و کێشەکان خودی مرۆڤە . بۆیە دەبینین سەرەتای زیادبوونی مرۆڤ سەرپێچی و بێ فەرمانی خودا 0٪ بووە . چونکە ئادەم و حەوا (علیما السلام) لە ژیاندا بوون .
بە تێپەڕبوونی کات سەرپێچیەکان سەریان هەڵداوە . کار گەیشتووەتە ئەوەی خودا مرۆڤی لەسەر زەوی کۆن نەهێشتووە بە تۆفانی نوح (علیه السلام) .. کەواتە دەبێت مرۆڤ جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ لای خودا .

چونکە ئەمجارەیان دوو بەڵگەیان لایە :
یەکەمیان : سەرپێچی ئادەم و حەوایە (علیهما السلام) .
دووەمیان : هەموو سەرپێچیەکانی دوای ئەوانە .

خۆشیان شایەت حاڵ بوون خودا سەرپێچیکارانی لەناو بردووە بەو تۆفانە . بەڵام جارێکی تر مرۆڤ سەرپێچیان کرد ئەوەتا ئێمە لە نەوەکانی نوحین (علیه السلام) لە کۆتایی زەماندا ئەو سەرپێچیانە دەبینین .

حیکمەتی خوداش لێرەدایە :
( هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ) ﴿الأنعام: 2﴾ .
خودای زانا لە قوڕ دروستی کردووین , ( ثُمَّ قَضَىٰ أَجَلًا ) ڕێگای پێداوین بگەڕێینەوە بۆ لای خودا واز لە سەرپێچی بهێنین هەتا ئەو کاتەی دەمرین .. پاشان جارێکی تر دەفەرمووێت : ( وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُ ) واتە بۆ کاتێکی تر دواتان دەخات ... دیقەت بدەن دوو کات هەیە ( **اجلا** ) لەگەڵ ( **اجلا مسمى** ) ..
پاشان دەفەرمووێت : ( ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ) لەگەڵ ئەوەش دا ئێوە هەر شك و گومان دەکەن .
ئێستا با بزانین شك و گومان لەچی دەکەین ؟..

ئایەتی پێش خۆی دەفەرمووێت :

( الْحَمْدُ لِلَّـهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ) .

خودا ئاسمانەکان و زەوی خەلق کردووە . تاریکی و نووری داناوە ، مەبەست لە ناسینی ڕێگای خودا بە (نور) تەعبیر کراوە ڕێگای غەیری خودا بە (تاریکی) . کەواتا ئێمە مادام خودا دەپەرستین , دەبێت ڕێگای نور هەڵبژێرین .

پاشان دەفەرمووێت : ئەوانەی کفر دەکەن (الله) و شتی تر هاوتا دەکەن بە (الله) .

لێرەدا 3 شتمان هەیە :

1- ( ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ) ، هاوتایی و یەکسانیمان هەیە لەگەڵ خودا دا .
2- ( ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ) ، شك و گومانمان هەیە , شك و گومانەکانمان وا دەکات شتی تر هاوتای خودا بکەین .
3- ( ثُمَّ قَضَىٰ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ) ، لە تەفسیری ئەم ئایەتە دا دەڵێن : (اجل مسمی) واتە : کاتی زیندوو بوونەوە .

منیش دەڵێم : کۆتایی ئایەتەکە بە خاڵی دووەم کۆتایی هاتووە , دەفەرموێت : (ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ) .
ئەگەر (اجل مسمی) بۆ ئاخر زەمان و زیندووبوونەوە بێت .
ئەوکات شك و گومان نامێنێت .. کابرای بێدین کە دەڵێت : خودا و فریشتە و زیندووبوونەوە درۆیە .
دەبینێت ڕاستە و شك و گومانی نامێنێت لە ڕاست و دروستی خودا و فریشتە و زیندوو بوونەوە .
ئەم نموونەیە قیاس بکەن بۆ هەموو گومانێکی پێش مردن . لە ڕۆژی قیامەت دا هیچ گومانێك نامێنێت و دەزانن خودا حەقە و ڕاستە .

بە گوێرەی بەدواداچوونم دەڵێم : ( اجل مسمی ) واتە : ئەم زەمانە کە ئێمە تێیدا دەژین و هاتنی دەجال و مەسیح و مەهدی و دوای ئەوان .
چونکە دوای ( اجل مسمی ), دەفەرمووێت : ( ثم انتم تمترون ), پاش ئەوەی خەڵك زیندوو کرایەوە و ڕاستیەکانیان بینی , خودا و فریشتە و دۆزەخ و بەهەشت بوونی هەیە . ئایا هیچ شك و گومانێك دەمێنێت ؟..
ئەگەر بڵێن : بەڵێ دەمێنێت ، ئەوە قسەیەکی نا لۆژیك و بێ مانایە لە ڕووی ئاینی و دنیایشەوە .
کەواتا ئەم ( تمترون )ـە لە کەیدایە ؟..

سەیری ئایەتەکان بکەن 3 جار ( ثم )ی تێدایە , واتا پاشان یان لەدوایی دا :

( الْحَمْدُ لِلَّـهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ( ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ )...
( هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ( ثُمَّ قَضَىٰ أَجَلًا )...
( وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُ ( ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ )...

ئەم ( ثم )ەیەی یەکەمیان ( ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ) گشتیە بۆ هەموو کات و زەمانێکە هەتا پێش کۆتایی زەمان و زیندوبونەوە .

لە کۆندا , سەرۆکی دەوڵەتەکان خۆیان بە خوداوەند دادەنا و خەڵکیش شوێنیان دەکەوتن . 1300 ساڵە ئاینی ئیسلام هەیە , ئەو خودایەتیەی نەهێشتووە و هیچ کەس و هیچ دەسەڵاتێك هاوتای خودا نییە .

لەم 100 ساڵەی کۆتایی دا , هەتا ئێستا کە 2019 یە . هاوتاکانی خودا زۆرن ، کڵێسا یەك هاوتای خودایان هەیە ئەویش (مەسیح)ـە . بودایزم یەك هاوتایان هەیە (بودا)یە ، وەك لایەنی دەسەڵاتی سیاسیەکان یەك خودایان هەیە ئەویش (ئەمریکا)یە , ئەوەی ئەو بیڵێت جێبەجێ دەکرێت .

ئێستا وەرن بۆ لای ئێمەی موسوڵمان ، خوداکان هێندە زۆرن ئیرەیی بە بت پەرستەکانی جاران دەبەین . سەیری ئومەتی ئیسلام بکە هەزاران فیرقەن ، لەناو ئەم فیرقانەشدا هەزاران مامۆستا و ڕەوتی جیاجیان .
من و تۆی موسوڵمان فەرمان لە (الله) و قورئان وەردەگرین یان لەو خوداوەندانە ؟
هەموتان دەڵێن ئێمە لە (الله) و قورئان وەری دەگرین .
دەپرسم :
کەواتا بۆ ئەم هەموو فیرقە و ڕەوت و مامۆستایە هەیە و هەر یەکەی بە ئارەزووی خۆی شیکاری بۆ دین دەکات ؟..
ئەی بۆچی تۆی تاکی موسوڵمان تەنها لایەن و مامۆستا و ڕەوتەکەت بە راست دەزانیت و بە تەنها ئاین لەو وەردەگریت ؟..
بۆچی هەموومان سەرمان لێ تێك چووە , نازانین کێ ڕاست دەکات و ئاین لە کێ وەرگرین ؟..

خۆ هەموومان دەڵێین : ( الْحَمْدُ لِلَّـهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ ) ..
هەمووشمان باوەڕمان هەیە ئەو خالقە ( جَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ) ..
بۆچی ناتوانین ئەو (ظلمات و نور)ـە لێك جیا بکەینەوە و بزانین کام مامۆستا و ڕەوت و لایەن ڕاست دەکات ؟
هەر خودای زانا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێت : ( ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ) ..

ئەم هاوتاییەی ئێستای خودا و ئاینەکەی بە مامۆستا و لایەن و ڕەوتەکان هەر لە ئایەتی ( 30 التوبة) دا باسکراوە :
( ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ ) ..
سەیری مامۆستا و ڕەوت و لایەنە ئیسلامیەکان بکەن ، هەرهەموویان بە دەم و بە شیکاری خۆیان لا راستە , وە خەڵکی عەوامیش قسەی ئەوان وەردەگرێت بە دینی خودا ..
کەواتا دین لە خودا وەرناگرن , بەڵکو لە مامۆستاکانیان . ئەمەیە مانای : ( ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ) ..

پاش ( ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ ) ... دەفەرمووێت : ( يُضَاهِئُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ ) ..
واتە : تەقلید و لاسایی , لەگەڵ لاساییەکەش دا زیاتر دەکەن لە بەرامبەریان . واتە : وەك ئەو دەکەنەوە بە زیادەوە بۆ ئەوەی لەوەی ئەوان باشتر و زیاتر بێت .

بۆ ئەوەی جوانتر تێبگەن , سەرەتا باسی پێش ئەوان دەکەم :

پێشتر فرەخودایی هەبووە، هەر خوداوەندێك زێوان و کاهینی تایبەتی خۆی هەبووە . هەر خوداوەندێ شوێنکەوتەی خۆیی هەبووە .

واتە جوولەکە و گاورەکانیش لاسایی ئەوانەی پێش خۆیان دەکەنەوە . لێرەدا گرنگە ئەوە بزانن حاڵی موسوڵمان لە ئێستادا 100٪ حاڵی جووەکانە , لەو کاتەدا خودا مەسیحی بۆ ناردن . بۆیە خودا مەسیحمان بۆ دەنێرێت ،

بۆ زانیاریی زیاتر سەیری کتێبی (ئاخر زەمان لە دیدی قورئان)[1] بکەن .

سەیری حاڵی موسوڵمانیش بکە ، هەر مامۆستا و حیزب و لایەن و ڕەوتێك, بە هەزاران زێوانیان هەیە ، ئەم زێوانانە کاریان ئەوەیە لایەنەکانیان بەرز ڕادەگرن .

سەیر بکەن لە هەموو لایەکەوە لێمان دەدرێت . ئەو لایەنانە هەمو خاوەنی میدیان و هیچیان وەڵامی دژە ئیسلام نادەنەوە ..

ئەگەر باسی مامۆستا و ڕەوت و لایەنەکەیان بکرێت . نەك میدیاکانیان , بەڵکو ناو بازاڕیشت لێ دەوروژێنن.

ئەمەش ڕاستیە و هەموان دەیبینین.

ئینجا وەرە سەر باسی شەڕە ڕەوت و لایەن و مامۆستا . وەڵامی فلان ڕەوت یان فلان مامۆستا بۆ فلان ڕەوت و فلان مامۆستا , قیامەت هەڵدەستێت !.. لە کاتێك دا هەرهەموومان دەڵێین : (الْحَمْدُ لِلَّـهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ) , بەڵام کەسمان لەسەر خودا بە دەنگ نایەین و خوداکەمان لایەنەکانمانە , (ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ) ئەمە مانای ئەو زەمەنەیە ( ثم ) پاشان ئەوانە هاوتا بۆ خودا دادەنێن .. بەوەشەوە ناوەستن بە شەڕە قسە ناوەستن , بەڵکو (يُضَاهِئُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ) , ئیبداع دەکەن لە وەڵام دانەوەی بەرامبەر و بەرز ڕاگرتنی لایەنەکانیان .

هەر کەس شارەزا بێت لە ئاینە کۆنەکان و خوداوەند و بتەکان .

لەم مضاهاتە باش تێدەگات کە چۆن خەڵکەکە باسی گەورەیی خوداکانیان دەکرد و شتی زیادیان باس دەکرد لە کە خوداکانی تر دا بوونی نەبوو .

پاشان دەفەرمووێت : (قَاتَلَهُمُ اللَّـهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ) , (قاتلهم) لە قورئاندا بە مانای نەفرەت دێت واتا خودا نەفرەتیان لێدەکات . چونکە (اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّـهِ) , جووەکان حیبرەکانیان کردووە بە خودا و ئاین لەوان وەردەگرن نەك لە خودا . گاورەکانیش لە قەشەکان ئاین وەردەگرن .

سەیری ئێستای ئێمەش بکە بە هەزاران حیبر و راهبمان هەیە , هەموو بە ناوی خوداوە قسە دەکەن .

خەڵکی پاك و بێ گەرد نازانێت دین لە کامیان وەرگرێت ؟..

چونکە ئەم هەموو خوداوەندە لە ئیسلام دا پەیدا بووە دەبێتە هۆکاری ئەوەی خودا و ئاینەکەی بزر ببێت .

ئێستا خودا و ئاین بزرە . نیوەی تێکدانی ئاین لە لای خۆمانە . (يُرِيدُونَ أَن يُطْفِئُوا نُورَ اللَّـهِ بِأَفْوَاهِهِمْ) ..

---

لینکی کتێبی (ئاخر زەمان لە دیدی قورئان)[1] :

https://drive.google.com/file/d/1QdqZk_E6DcRZYpgp3vgScrHFYws_S1_g/view?usp=sharing

خودای خاوەن دەسەلات رازی نابێت ئەم ئاینەی بفەوتێت : (وَيَأْبَى اللَّـهُ إِلَّا أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ) ..

کافرانیش هێزێکی گەورەیان هێناوە بۆ ناوچەکە ، هاتنی ئەم هێزانە و ئەم پلانانە هەر هەمووی لە بەرژەوەندی موسوڵمان و ئاینی ئیسلامی مەزنە .

ئێران و ئەمریکا سەر دەکەون و دەبن بە زلهێز .. سودی ئەم زلهێزیە ئەمەیە :
سەرکەوتنیان دەبێتە هۆکاری لاواز کردنی (ئال سعود) و ئاینی سەلەفیزم , وە ناساندنی ڕاستی ئەم ئاینە و احبار و رهبانەکانی ..
(قَاتَلَهُمُ اللَّـهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ) , هەموو دنیا کۆبێتەوە ناتوانێت (ئال سعود) لاواز بکات و حەقیقەتی دەر بخات ، خاوەنی هێز و دەسەلاتن . بەڵام بەرامبەر خودا کەس خاوەنی دەسەلات نیە . بۆیە پێویستە خودا تداخل بکات .
هەر بە خۆیان لە خۆیان دەدات , ( إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا وَأَكِيدُ كَيْدًا . فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا )

موسوڵمان, بە لێدانی ئال سعود (مەبەستم ڕووخاندنیان نییە) بەڵکو لاواز بوونیان و دەرخستنی ڕاستی ئاینی سەلەفیزم 50٪ی ئاینی خودا سەردەکەوێت .
ئەو گروپە جیهادیانەی بە ناوی قاعیدە و داعش و ئەوانەی لەم ماوەیەی دواتر دێت نامێنن . چونکە ئال سعود و پارە و دەسەلات و فەتوا فرۆشەکانیان دەبێت لوتیان بشکێندرێت , بۆ ئەوەی دەسەڵاتی شیعە و ئەمریکا ببن بە گەورەترین هێز لە جیهان دا .
ئەمە هەنگاوی یەکەمی ئەم ساحەی شەڕەیە . خودای خاوەن دەسەڵات ، فەتوا فرۆشەکانمان لە کۆڵ دەکاتەوە .
چونکە 100٪ی کێشەکان (ئال سعود) و سەلەفیزمن .

بەم شێوەیە خودای خاون دەسەڵات ( قَاتَلَهُمُ اللَّـهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ) بە نەفرەتیان دەکات لە دنیا دا لەبەر چاوی دیندار و بێدین .
بە نەمانی ئال سعود و سلفیزم هەمو کێشەکانی ئاینی ئیسلام حەل دەبێت .
ئینجا دەبێت بچینە بەری ئەوبەر و بزانین بەرەی سەرکەوتوو ئەمریکا و ئێران چی هەیە و چی دەگوزەرێت ؟

پێش ئەوەی بچیتە بەری ئەو بەر دەبێت خۆت بناسیت . خۆت نەناسیت , دەکەویتە داوی تەڵەی بەرەی سەرکەوتووەوە . باشترین ڕێگاش بۆ خۆ ناسینت دەبێت بزانیت لە دیوەخان چ باسە ؟

زۆر لە موسوڵمانان دەپرسن :باشە ئێمە دوای کێ بکەوین و چی بکەین ؟
کتێبی ( هەباسە , لە دیوەخان چ باسە )[1] بخوێنەوە .. دەزانیت دوای کێ بکەویت و چی بکەیت ..

---

لینکی ( هەباسە , لە دیوەخان چ باسە )[1]:

https://drive.google.com/file/d/1AxkVphL5UgJ9SSAzQs9yVBYnxmsjbzjK/view?usp=sharing

بۆ ئەوەی لە یارییەکان تێبگەیت و تێنەکەویت . دەبێت بزانیت ئاخر زەمان چییە و چۆنە ؟..
کەواتا دەبێت کتێبی (ئاخر زەمان لە دیدی قورئان)ـت خوێندبێتەوە .

ئەگەر بتەوێت خۆت بناسیت و بزانیت شوێن کێ دەکەویت لەم فیتنەیە دا , دەبێت زانیت لە دیوەخان چ باسە ؟..

هەر کات زانیت ئاخر زەمان چیە و لە دیوەخان چ باسە ... ئەو کات دەبێت خودا بدۆزیتەوە.
چونکە لە ئێستا دا خودا بزرە لە نێوان ڕەوت و لایەن و مامۆستا ئاینیەکان دا .
وە من و تۆی تاکیش ئاین لەو وردە خودایانە وەردەگرین .
ئەگەر ئاینی خودا تێك نەچوایە و خودا بناسرێت لە لایەن موسوڵمانەوە . پێویستی نەدەکرد خودا مەهدی و مەسیحمان بۆ بنێرێت.

هەمووتان ئەم پرسیارە لە خۆتان بکەن :
ئەگەر لە هەر وڵاتێکی بەناو ئیسلامی , موفتیی ئەو وڵاتە و سەرۆکی لیجنەی فەتواکان کۆبکەینەوە . یەك ئایەت لە ئایەتەکانی قورئان بخەینە بەر دەستیان .. پاشان داوایان لێبکەین قسەی لەسەر بکەن ..
ئایا هەموویان یەك بۆچوون و یەك تەفسیریان بۆی دەبێت ؟..
ئایا لە کۆتایی کۆنگرەکە دا نابێت بە شەڕە لەقە ؟..
ئەگەر ئاینی ئیسلام ڕاستە و قورئان بۆ ئێمەیە ، بۆچی ئەم زانایانە ڕێك ناکەون ؟..
بۆچی تۆ خۆت بەستووەتەوە بە لایەن و مامۆستا و ڕەوتێکەوە و بەس ئەوت پێ ڕاستە ؟..

کەواتا خودا بزرە و دیار نییە .. بۆ ئەوەی خودا بدۆزیتەوە , ئەم کتێبە بخوێنەوە : ( کوا خوا ؟ ) ..

https://drive.google.com/open?id=1kxcRW5aXLbE6G8RDlSXU2CZ7ofz7AU_7

چونکە گەر خودا نەدۆزیتەوە , بزر دەبیت لەم ڕووداوانەی داهاتوو دا ..

کەواتە بۆ ئەوەی بزر نەبیت دەبێت بزانیت :
ئاخر زەمان چییە ؟..
پاشان خۆت بناسیت ..
پاشان خودا بدۆزیتەوە..
ئەو کات دەزانیت کاتێك بەرەی ئەمریکا و ئێران سەرکەوتن دەوری تۆ چی دەبێت ؟..

بۆ ئەوەی باشتر تێبگەیت .. دەبێت قورئانەکەشت بدۆزیتەوە .
سەیری ئەم لینکە بکە و قورئانەکەشت بدۆزەوە :

https://drive.google.com/file/d/1w6ti05VVkQOA4bl_Pg5vumG8nCm4LfgY/view?usp=sharing

هۆکاری نەزانیمان وەك تاك لە چی بەرەیەك بین ئەوەیە کە ئێمەی موسوڵمان قەومێکی نەخوێندەوارین .

(سەلەفیزمی وەهابی لۆرانسی) هاتووە لەسەر ئەم پەتە یاری دەکات .

کاری بیرکردنەوە و عەقڵی ڕاگرتووە ، قورئان پڕە لە ئایاتی : لعلکم ( تعقلون و یعقلون و تتفکرون و یتفکرون و تذکرون و یتذکرون و تتذکرون ) .

سەلەفیزم لە قورئانیش لایان داوە ، کاری بیرکردنەوە و تێگەیشتنیان قفڵ کردووە لە هزری تاکی سەلەفی دا بۆ ئەوەی موسوڵمان بە گەمژەیی و نەزانی بمێنێتەوە . بۆ ئەوەی هیچ نەزانێت و حوکم لای وەلی ئەمر بێت .

ئەگەر موسوڵمان بیری کردەوە و لە دینەکەی تێگەیشت . ئەو کات (وەلاء و بەرائی) بۆ خودا دەبێت نەك بۆ (وەلی ئەمر) یان ڕەوت یان لایەن و مامۆستاکەی .

بۆیە دەبینین هەر کەس شیکاری بۆ ئاین بکات و لەسەر ڕێچکەی ئەوان نەبێت بە حدادی و اخوانی و سەگبابی و هەمو ناوێکی ناشرین ناوزەندی دەکەن تەنانەت ژن و کچ و خوشك و دایك و خۆشی سووك دەکەن .

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە دەسەڵاتی ئاینی لە وەهابی لۆرانسی وەربگیرێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ لای (الله) .

بۆ ئەوەی جوانتر تێبگەن کە چۆن ئەم سەلەفیانە ڕێگەیان گرتووە لە بیرکردنەوە و دەبێت ئومەتی ئیسلام وەك ئەوان بیر بکاتەوە . شیکاری بۆ ئەم ئەم حەدیسە دەکەین ، چونکە موعجیزەیەکە باسی داهاتوو دەکات .

الحمد لله ئێمە لەم زەمانەدا دەژین و ئەو داهاتووە دەبینین کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردووە . ئەگەر شیکاری بۆ بکەین ئایا تاوانبارین یان حەدادین یان عەرشی مەدخەلیەت دەهێنێتە نەمان ..

بۆیە قەت ناهێڵن شیکاری بکرێت بۆ هیچ دەقێکی قورئان و حەدیسیش .

دەبێت دین و دنیا , لە دیدی ئال سعودی وەهابیەوە ببینین .

با بچین بۆ خزمەت حەدیسەکە :

ئەم حەدیسە لە هاوەڵی بەڕێزەوە ( حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ ) گێڕدراوەتەوە دەفەرموویێت :

( كَانَ النَّاسُ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الْخَيْرِ و كُنْتُ أَسْأَلُهُ عَنْ الشَّرِّ مَخَافَةَ أَنْ يُدْرِكَنِي )

خەڵکی پرسیاری خێر و خۆشیان لە پێغەمبەر دەکرد (ﷺ) , بەڵام من پرسیاری شەڕ و ناخۆشیم لێ دەکرد .

بۆ ئەوەی کاتێك کەوتمە شەڕ و ناخۆشیەوە بزانم چی دەکەم ؟.. بۆیە لێم پرسی :

( فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا فِي جَاهِلِيَّةٍ وَشَرٍّ فَجَاءَنَا اللَّهُ بِهَذَا الْخَيْرِ فَهَلْ بَعْدَ هَذَا الْخَيْرِ مِنْ شَرٍّ )

گوتم ئەی نێردراوی خودا (ﷺ) , ئێمە لە زەمانی نەزانی و جاهیلی و شەڕدا بووین . خودا ئەم خێرەی بۆ هێناین ، مەبەستی ئاینی ئیسلامە . ئایا دوای ئەم خێرە شەڕ هەیە ؟..

دیقەتی سەرەتای پرسیارەکە بدەن ، ئەم هاوەڵە بەڕێزە (خێر و شەڕ)ی بە (بتپەرستی و الله پەرستی) بەستووەتەوە .

ئەم پرسیارە ئەسڵی هەموو ئاینەکان و ژیان پێکەوە دەبەستێت و گرێ دەدات . چونکە ئاین واتا شێواز و چۆنیەتی ژیانی مرۆڤ لە هەموو لایەنێکەوە , هەر کات مرۆڤ الله و ڕێگای اللهی نەناسی واتا هەموو ژیانی شەڕ و ناخۆشیە .

پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامی پرسیارەکەی دا , دەفەرمووێت : ( قَالَ نَعَمْ ) , بەڵێ دواى ئەو خێرە شەڕ هەیە .
مەبەستی خۆشەویست (ﷺ) لەو شەڕە , کوشتنی (عمری کوڕی خطاب و علی و عثمان)ـە خودا لێیان ڕازی بێت .
سەرەتای سەر هەڵدانی ( شیعە و سۆفیزم و موعتەزلەیە ) .

پاشان پرسیاری لێدەکات و دەڵێت:
( قُلْتُ وَهَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الشَّرِّ مِنْ خَيْر )
( قالَ نَعَمْ وَفِيهِ دَخَن )
واتە :
پێمگوت : ئایا دواى ئەو شەڕە خێر هەیە ؟..
فەرمووی : بەڵێ دواى ئەو شەڕە ، خێر هەیە و خێرەکە دوکەڵی هەیە .

لێرەدا دیقەتی فەساحەت و بەلاغەتی خۆشەویست بدەن (ﷺ) , ڕووداوێکمان بۆ باسدەکات لە داهاتوو دا دێت .
شەڕ و گرژی ئەو ڕووداوە بە دوکەڵ ناو دەبات .
هەمووان دەزانین , دوکەڵ واتا بوونی ئاگر ، هەر کەس دوکەڵ ببینێت دەزانێت ئاگرێك کەوتوەتەوە .
ئاگریش جۆرا و جۆرن , زۆر و کەمن . کاتێك دوکەڵ دەبینین , ڕادەی ئاگرەکە دەزانین زۆرە یان کەمە بەڵام
نازانین هۆکارەکەی چیە و کێ ئەو ئاگرەی کردەوە و بڵێسەی ئاگرەکە چەند زیانی داوە .

بوونی دوکەڵ واتە زانینی ڕووداوێك ، لێرە دا خەڵکی هەر یەکە شتێك دەڵێن : لەسەر ئەو دوکەڵە .
دیقەتی وردبینی ئەم حەدیسە بدەن ، پاش ماوەیەك لە دوکەڵەکە هەواڵ بڵاو دەبێتەوە هۆکاری ئەو ئاگرە چی بووە
ئەم هەواڵەش بە گوێرەی دوور و نزیکیت لە دوکەڵەکەوە دەور دەبینێت . چەند دوور بیت درەنگتر هەواڵەکەت
پێدەگات . هەر چەند نزیك بیت هەواڵەکەت زووتر پێدەگات . بەڵام ئەوانەی زۆر نزیکن .
دوکەڵەکە نا بینن بەڵکو لەناو ئاگرەکەدان . ئەمەش مانای ئەوەیە : ئەو خێرەی پێغەمبەر ﷺ باسیدەکات .
ئەوەیە هەر کەس لەو زەمانە دا شەڕ و فیتنە دروست بکات دەسووتێت .
بەڵام ئەوانەی دوورن لەو شەڕ و فیتنەیەوە , یان خۆیان دوور دەخەنەوە ,وەك ئەوە وایە دوکەڵی ئەو شەڕە ببینن .
ئەو دوکەڵەش خەڵکی شیکاری بۆ دەکات :
زیانی چەند بووە ؟ کێ هۆکار بووە ؟ زائیدەن قسە و مبالەغەی خەڵکی بۆ ڕووداوەکە . لێرە دا ڕاستیەکان دەشێوێت
و کەس نازانێت چی ڕوویداوە و هۆکار و ئامانجی سەرەکی ئاگرەکە بزر دەبێت .

بۆیە خۆشەویست (ﷺ) باسی ئاگرەکە ناکات . هۆکاری سەرەکی دوکەڵەکە ئاگرەکەیە , چونکە هیچ دوکەڵێك بێ
ئاگر نابێت .

لێرەدا دیقەتی زیرەکیی و وردبینی ( حذيفة ) و هاوەڵان بدەن ، دەیانەوێت لە هەموو شت تێبگەن بۆ ئەوەی
نەگەڕێنەوە بۆ شەڕ و جاهلیەت لە خۆشەویست دەپرسێت : ( قُلْتُ وَمَا دَخَنُهُ ؟ )
پێمگوت : دوکەڵەکەی چییە ؟..

لێرەدا دیقەتی ئەدەب و ڕادەی تێگەیشتنی کەسێکی بت پەرستی جاهیل بدەن لە شەڕەوە گۆڕاوە بۆ خەیر .
ناپرسێت : هۆکاری دوکەڵەکە چیە ؟.. یان ناڵێت : کێ ئەو ئاگرە هەڵدەگیرسێنێت ؟..
بەڵکو دەپرسێت : دوکەڵەکەی چییە ؟

ئەمیش لە دیدی خۆشەویستەوە (ﷺ) سەیری ڕووداوەکە دەکات . لە قسە تێدەگات و دەزانێت بەرامبەرەکەی کێیە و ئەدەبی تێگەیشتنی لە قسە هەیە .
واتا لە گۆشەی دوورەوە وەك خەڵکەکە دوکەڵەکە دەبینێت . دەیەوێت نەکەوێتە ناو قسە و قسەڵۆکەوە ، کاتێك دوکەڵەکەی بینی .
خۆی بزانێت ئاگرەکە کێ کردوویەتیەوە و هۆکارەکەی چی بووە و دەستی کێی تێدا بووە ؟..
واتە : لە دوکەڵەکەوە شیکاری بۆ ئاگرەکە بکات و ئەسڵی ئاگرەکە بدۆزێتەوە .

لە وەڵام دا خۆشەویست (ﷺ) هۆکاری دوکەڵەکە و ئاگرەکەی بۆ ڕوون دەکاتەوە و دەفەرمووێت :
( قَالَ قَوْمٌ يَهْدُونَ بِغَيْرِ هَدْيِي تَعْرِفُ مِنْهُمْ وَتُنْكِرُ )

واتە : ئەوانە کەسانێکن شوێن ڕێگای من ناکەون . لەگەڵ ئەوەش دا شتیان لێ وەردەگیرێت و ڕەتیش دەکرێتەوە .
ئەم قسەیە و ئەم ڕوونکردنەوەیە زۆر گرنگە و دەبێت بزانین باسی کەی دەکات ؟..

سەرەتای حەدیسەکە باسی زەمانی شیرك و جاهیلیەت دەکات لە شەڕەوە گۆڕاوە بۆ خێر و ئاینی ئیسلام .
( إنا كنا في جاهلية وشر فجاءنا الله بهذا الخير فهل بعد هذا الخير من شر )
پرسیاری دوای ئەوەی لێدەکات و دەڵێت شەڕ هەیە ؟..
دیقەتی وەلامەکە بدەن زۆر کورتە بە تەنها دەفەرمووێت : ( قال نعم )
وەك باسمان کرد کوشتنی ئەو سێ خەلیفەیە بوو .

پاشان زەمەنی دووەم , پاش کوشتنی ئەو سێ خەلیفەیە ، (حذيفة) پرسیار دەکات :
( قلت وهل بعد ذلك الشر من خير قال نعم وفيه دخن )
لە وەڵامی زەمانی دوای ئەودا بە ( نعم ) وەڵام ناداتەوە , هەروەها ( و فيه دخن ) زیاد دەکات .

مەبەست لێرە دا مێژووی 1250 ساڵی ئاینی ئیسلامە , هەتا کەوتنی دەوڵەتی عوسمانی . چونکە (حذيفة) پرسیاری هۆکاری ئەو دوکەڵە دەکات و دەڵێت : ( قلت وما دخنه ؟ )
خۆشەویست (ﷺ) وەڵام دەداتەوە : ( قال قوم يهدون بغير هديي تعرف منهم وتنكر )

ئێستا سەیری مێژووی ئەو 1250 ساڵە بکەن .. ئایا شیعە و سۆفی و معتزلة هەموو شتێکیان خراپە ؟..
ئایا دەکرێت هەمو, مەنهەجەکانیان ڕەت بکەینەوە ؟..

وەڵام : نەخێر .
بەڵگەت چییە ؟
بەڵگەم ئەوەیە : ئایا لە ماوەی ئەو 1250 ساڵە دا , هیچ زانایەکی ئاینی یان دەسەڵاتێکی ئیسلامی هەموو فکر و عەقیدەی ئەو سێ ڕێبازەیان پووچەڵ کردوەتەوە ؟..
وەڵام : نەخێر .
ئایا ئەو سێ مەنهەجە لەسەر ڕێچکەی پێغەمبەر بوون ؟
( قال قوم يهدون بغير هديي )
وەڵام : نەخێر .
ئایا ئەو سێ ڕێچکەیە شتیان لێ وەرگیراوە و ڕاست بووە وەك لایەنی ئاینی , وە شتیشیان لێ ڕەت کراوەتەوە ؟..
وەڵام : بەڵێ ( تعرف منهم وتنكر )..

بناغەی شەڕ و تێکچوونی دینی ئیسلام ئەو سێ فیرقەیە بوون . لێرە دا دەبێت بپرسین :
بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) , بە دوکەڵ ئاماژەی بە حوکمی 1250 ساڵ داوە ؟..
ئەگەر سەیری شیکاریی وشەی ( دخن ) بکەین , لەو حەدیسەدا بە ( حقد و فساد القلب ) شیکاری بۆ کراوە . |
واتە : ڕق و کینە و تێکچوونی دڵ .
لە ئەسڵ دا ( دخان واتا دوکەڵ ) لە ( دخن ) هاتووە ، واتا هەر شتێك لە سووتاندن بەرز بێتەوە . دوکەڵیش بەهۆی سووتاندن بەرز دەبێتەوە ، بۆیە پێی دەڵێن ( دخان ) بۆیە , دوژمنایەتی و ناکۆکیش هەر پێی دەڵێن ( دخن )
کوردەواریی خۆشمان هەمان شت بەکار دەهێنێت , دەڵێت : ئاگر خۆش مەکە ، مەبەستی شەڕە نەك ئاگر کردنەوە بە شقارتە و دار یان شتی تر .
ئەگەر بەگوێرەی ڕووداوەکان شیکاری بکەین ، (دخن) زیاتر بە دوکەڵ شیکاری دەکرێت نەك ڕق و کینە و تێکچوونی دڵ ، دواتر دێمە سەر باسی .

ئەم 1250 ساڵەی ڕابورد . ئاگری شەڕ لە چەندین شوێن هەڵگیرساوە . بەڵام دەوڵەتی ئیسلامی بەهێز هەبووە ، دوکەڵەکەیان بینیوە بەرەو شوێنی ئاگرەکە ڕۆشتوون ، ئاگری شەڕ و فیتنە و ڕق و کینەی بەرامبەریان کوژاندوەتەوە و بنە بڕیان کردووە .
پرسیاری دوای ئەو گرنگە و باسی زەمانی ئێمە دەکات و پاش ئەو دوکەڵە , (حذيفة) دەپرسێت :
( قلت فهل بعد ذلك الخير من شر )

دیقەت بدەن حوکمی ئەو 1250 ساڵە بە (خیر) ناوبراوە ، شەڕیشی تێدایە بەلام شەڕەکەی هیچ نییە و دوکەڵ و ڕق و کینەی فیرقەیەك لە فیرقە ئیسلامیەکانە .

چونکە پرسیارەکەی (حذيفة) دەڵێت : ( قلت فهل بعد ذلك الخير من شر ) .. ئایا دوای ئەو خێرە شەڕ هەیە ؟
پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت : ( قال نعم دعاة على أبواب جهنم من أجابهم إليها قذفوه فيها )

فەرموی : بەڵێ ، بانگەشە دەکەن بۆ دەرگاکانی دۆزەخ . هەر کەس گوێڕایەڵیان بێت و شوێنیان بکەوێت فڕێی دەدەنە دۆزەخەوە .
واتا هەوڵ و کۆششی ئەوانە بۆ دۆزەخە , نەك بۆ خودا . ئینجا (حذيفه) دەڵێت : بۆمان وەسف بکە ئەمانە کێن ؟..
دیقەت بدەن لێرەدا خەڵکی تریش هەیە بێجگە لە (حذيفة) , چونکە بە کۆ قسە دەکات ( صفه لنا )
خۆشەویست (ﷺ) دەفەرمووێت : ( قلت يا رسول الله صفهم لنا قال هم من جلدتنا ويتكلمون بألسنتنا ) .

دیقەتی ئەو وەسفە دەقیقە بدەن !
( قال هم من جلدتنا ) . (جلدتنا) لە ( جلد ) هاتووە , جلد واتا پێست .
کاتێك عەرەب دەڵێت : (من جلدتي بە تاك , یان بە کۆ جلدتنا ) . واتە : لە خۆمانە یان لە خۆمانن ،
مەبەستی لەوەیە لە نەوەی ئێمەن و عەرەبن .
پاشان دەفەرمووێت : ( و يتكلمون بالسنتنا ) واتە بە زمانی ئێمە قسە دەکەن .
ئەمە بەڵگەی حاشا هەڵنەگرە کە ئەمانە عەرەبن و بە زمانی عەرەبی قسە دەکەن . خۆشمان دەبینین , کە ئەوانە ئال سعود و عولەما وەهابیەکانن . وەسفەکەی پێغەمبەر (ﷺ) وردە و دیارییکردوون ئەمانە کێن ؟..
مەبەست موسوڵمانان نییە بە گشتی . چونکە موسوڵمان بە گشتی لە (جلدة)ی پێغەمبەر نین (ﷺ) . بە ملیۆنەها موسوڵمان هەن زمانی عەرەبی نازانن . حەدیسەکە دەفەرمووێت : (و يتكلمون بالسنتنا) .
ئەم بەشەی حەدیسەکەش باسی ئەم 100 ساڵەی کۆتایی دەکات , پاسان (حذيفة) دەپرسێت :
( قلت فما تأمرني إن أدركني ذلك )

واتە , پێمگوت : فەرمانم بەچی پێ دەکەیت ئەگەر کەوتمە ئەو کاتەوە ؟..
پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ( قال تلزم جماعة المسلمين وإمامهم ) , پابەند بە بەکۆمەڵی موسوڵمانان و ئیمامەکەیانەوە
(حذيفة) پرسی : ( قلت فإن لم يكن لهم جماعة ولا إمام )
واتە : ئەگەر هیچ کۆمەڵێکی ئیسلامی نەبوو و ئیمامیشیان نەبوو ئەو کات چی بکەم ؟..
خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی :
( قال فاعتزل تلك الفرق كلها ولو أن تعض بأصل شجرة حتى يدركك الموت وأنت على ذلك ) .
وەڵامی دایەوە فەرمووی : جیا ببەرەوە لە هەمو ئەو کۆمەڵانە و دوور بکەوە لێیان . تەنانەت ئەگەر گاز بگریت لە قەدی دارێك هەتا دەمریت بەو شێوەیە بمێنەوە .

( العض باصل الشجرة ) واتە گاز یان قەپاڵ گرتن لە قەدی دارێك . خۆتان دەزانن مرۆڤ گاز ناگرێت لە دار ، مرۆڤ گاز گرتن بەکار دەهێنێت بۆ خواردنی هەموو جۆرە خواردنەکان . پاشان قەدی هەموو دارێك گەورە و ئەستوورە ، هیچ مرۆڤێك ناتوانێت گازی لێبگرێت و دەمی بە هێندەی ئەو قەبارەیە ناکرێتەوە .

مەبەستی خۆشەویست (ﷺ) لەوەیە : کاتێك ڕێنمایی (حذیفة) دەکات و پێی دەڵێت : ( جیا ببەرەوە لە هەموو ئەو کۆمەڵانە و دوور بکەوە لێیان ) . ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی هیچ کۆمەڵێك ڕاست نین و کۆمەڵەکان زۆر زۆرن .

ئەگەر یەکێکیش بیەوێت لێیان جیا ببێتەوە ، مەجبوورە دووربکەوێتەوە لەناو شار و شوێنە قەرەباڵەخیەکان و بچێتە دەشت و دەر و بە تەنها بێت .
هەر کاتیش بە تەنها بیت , دەبێت بە دوای خواردن دا بگەڕێیت . لە دەرەوەی شاریش دار زۆرن داریش هەموو کات بەری نییە . ئەگەر بەر و بومیشی هەبێت بۆ ماوەیەکی کاتییە مرۆڤ دەتوانێت لێی بخوات .

مەبەستی خۆشەویست (ﷺ) ئەوەیە : ئەگەر لە برسان گاز بگریت لە دار , باشترە بگەڕێیتەوە و تێکەڵی ئەو کۆمەڵانە ببیت . داوای لێدەکات هەتا دەمریت بەو شێوەیە بمێنەرەوە و مەگەڕێوە ناویان .

ئێستا با بێینە سەر شیکاری ئەم حەدیسە :

لایەنێکی تری گاز گرتن لە دار , ئەمەشی لێ دەخوێندرێتەوە . پێغەمبەران (علیهم السلام) دڵنیان خودا ڕزق دەدات و کەس لە برسان نامرێت .

کاتێك ئامۆژگاری (حذیفة) دەکات دوو لایەنی تر دەردەکەوێت :

**یەکەم** : ئەو کێشە و کێشمە کێشانە درێژ خایەنن , موسوڵمانی ڕاست و دروست کە دەچێتە چۆڵەوانی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو نیە و بگەڕێتەوە . بەڵکو هێندە درێژ خایانە کابرا لە برسان دەمرێت .

**دووەم** : ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ناو خەڵکی ، سەرچاوەی ڕزق کۆنترۆڵ کراوە و ئیجبارت دەکەن شوێن لایەنێك و کۆمەڵێك بکەویت ئەگینا پارەت دەست ناکەوێت بۆ بژێوی ژیانت .

خۆمان لە ناوجەرگەی ئەو شەڕ و فیتنەیە داین و لە عێراق دەژین . دەبینین لەم ماوەیەی کۆتایی دا 4 ساڵە فێرمان دەکەن چۆن بە ڕەزالەت بژین و بە بێ مووچە و روبعە مووچە و نیو مووچە هەڵیان سەنگاندین بایی چەندین ؟..

باشووری عێراقیش لە ئێمە خراپترن , لە تاو بێ پارەیی دەبن بە (حشد الشعبي) .
خودا دەزانێت چی ترمان بەسەر دێت لەم ماوەی چەند ساڵەی داهاتوو دا و چۆن یاری بە ڕزق و ڕۆزیمان دەکەن و ئیجبارمان دەکەن شوێنیان بکەوین .

ئەگەر خوێندنەوە بۆ ئەو حەدیسە بکەین , دەبینین خۆشەویست چۆن باسی هەواڵێکی غەیبی کردووە بە وردەکاری .

(ئال سعود و سەلەفیی وەهابی) کاریان ئەوەیە ناهێڵن هیچ کەس خوێندنەوە بۆ ئاین بکات و هەر کەس خوێندنەوە بکات ڕسوای دەکەن . ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئێمە ئەوان ڕسوا بکەین و سەلەفیزمی وەهابی بخەینە زبڵدانەوە .

ئەگەر سەیری حەدیسەکە بکەین باسی چوار قۆناغ دەکات :

**قۆناغی یەکەم** : (شەڕی یەکەم) : هەمووان دەزانین ڕزگار بوونی قورەیش و مرۆڤایەتیە لە بتپەرستیەوە بۆ خێر و ناسینی (الله) و توحید و سیستەمی نوێی ژیان .

**قۆناغی دووەم** : دوای مردنی پێغەمبەرە (ﷺ) , بە شەڕ وەسفی کردووە بەڵام شەڕێکی کورتە ئەویش باسمان کرد کوشتنی ئەو سێ خەلیفەیەیە .

**قۆناغی سێیەم** : بە خێر وەسف کراوە ماوەی 1250 ساڵ خیلافەی ئیسلامیە هەتا ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی .
ئەم قۆناغە زۆر گرنگە و ناکرێت بە کورتی باس بکرێت ، ئەگەر بە دوور و درێژی باس بکرێت هەزاران لاپەڕەی دەوێت . من لێرە دا بە کورتی باسیان دەکەم و ئاماژە بە خاڵە گرنگەکان دەدەم :
لەم ماوەیەدا و لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام دا . 3 هێز دروست بوون .
هەر سێکیان لە عێراقەوە دروست بوون :

**یەکەمیان** : شیعە بوو ، ئەمانە جووەکان دروستیان کردن لە پاشماوەی دەوڵەتی ڕووخاوی فارس و کیسرا بوون ، هەتا ئێستاش هەر لایەنگری فارسی مەجوسن و دوازدە ئیمامی هەر ئەوان دایان مەزراند.
خاڵی گرنگ ئەوەیە : شیعەکان سەرەتای دروست بوونیان زۆر لەم شیعانەی ئێستا باشتر بوون و دیندارتر بوون و دوور بوون لە خورافات .
بە مروری زەمان و سەدە دوای سەدە بەرەو خراپی ڕۆشتن , هەتا گەیشتووەتە ئێستا , خۆمان دەیبینین کەڵکی دینداریان پێوە نەماوە و لە بازنەی ئیسلام و قورئان دەرچوون .

ئەم شیعانە بە درێژایی 1250 ساڵ خەریکی فیتنە و ئاژاوە بوون بۆ لێدانی ئاینی ئیسلام . چەندین جار دەوڵەتی خۆیان دروست کردووە .
خاڵی گرنگ ئەوەیە : دەوڵەت و دەسەڵاتی ئیسلامی هەبووە . ئەو فیتنانەی بنە بڕ کردووە و دەوڵەتەکانی شیعەی ڕووخاندوە , بۆیە خۆشەویست ئەو زەمەنەی بە خێر وەسف کردووە دەسەڵاتی ئیسلامی هەبووە .

**دووەمیان** : سۆفیەکان بووە ، سۆفیزم زۆر کۆنە و کەس نازانێت کەی دروست بووە ؟.. واتا زۆر پێش ئیسلامیش هەبووە . ئەم سۆفیانە کەسانی عیرفانی و هەست ناسکن و لە خودا ترسن .
لە هەموو زەمانێکدا هەبوون , لای بابلی و فرعونی و سۆمەری ڕۆم و.. هتد ... ئەم جۆرە مرۆڤانە خودا پەرستی خۆیان دەکەن لە هەر جێگایەك بن . بۆیە سۆفیەکان بە درێژایی مێژوو لەگەڵ ئاینی ئەو کاتە و ئەو دەوڵەتەدا بوون و خودا پەرستی خۆیانیان کردووە .
هەتا نەچیتە جیهانی سۆفیزمەوە و لێکۆڵینەوە لە سەرچاوەکانیان نەکەیت نازانیت ئەمانە خەریکی چین و چی دەپەرستن ؟..

واتا خەڵکی عەوام نازانن سۆفیزم چییە ؟.. ئەوانەش کە شوێنکەوتەی تەریقەتێکن یان شێخێکن پێیان دەڵێن دەورویش ئەوانیش نازانن سۆفیزم چییە ؟..

چونکە کابرای دەرویش وەك سەرچاوە و بەڵگە نەبووە بە دەرویش ، بەڵکو هەستێکە لە ناخی دایە .
ئەم هەستەش دەگەڕێتەوە بۆ فطرەی کەسەکان بۆ خودا پەرستی و هەموو کەس ئەو هەستەی تێدایە .
بەڵام دەرویشەکان هەستیان ناسکترە و زووتر تێکەڵی خودا پەرستی دەبن . کاتێکیش خودا دەپەرستن زۆر بە دڵسۆزی و بە ملکەچیەوە پابەندی دەبن .

بۆیە ئەوەتەی مرۆڤ هەیە ، لە دوای ئادەم و حەوا و چەند نەوەیەك کە خودایان ناسیوە سۆفیزم بوونی نەبووە .
بەلام دوای ئەوەی ئاینی خودا بزر بووە ، ئەم کەسە دڵساف و خودا پەرستانە .
شوێن هەموو ئاینێك کەوتوون و خۆیان و خودایان تێدا دۆزیوەتەوە . چونکە ئەقڵی دەرویش و ئەم جۆرە مرۆڤانە ، شوێن سەرچاوە ناکەوێت بەڵکو ئەو وزەیەی لە ناخی دایە لە یەکێك لەو ئاینانە یان ئەو خودایانە بەتاڵ دەکاتەوە کە لەو شوێنە هەیە لێی دەژی .
ئەسڵی هەموو ئاینەکانی سۆفیزم لە هەموو ئاینە بتپەرستەکان و ئاینە دروست کراوەکانی دەستی مرۆڤ و ئاینە خوداییەکانی وەك جوولەکە و مەسیحی و ئیسلام یەك شتە .

لەسەر ئەم بنەمایە پێك هاتووە . سەر گەورەی ئەو کۆمەڵە دەچێتە خەڵوەتەوە هەرچیەك دەبینێت دەبێت بە بنەما و ڕەگ بۆ ئەو کۆمەڵە . ئەم کارەش پێی دەڵێن : ( مشاهدة ) . ئەم گەورەیە ئەم مشاهدەیە تێکەڵ دەکات لەگەڵ ئەو نووسراوانەی لەو ئاینە دا هەیە .
بۆ نموونە جوولەکە لە فرعەونەکانەوە فێری سیحر بوون . شوێن مووسا (علیە السلام) نەکەوتن ، یەکەم کاریان ئەوە بوو گوێرەکەیەکیان دروست کرد ئەیبۆڕاند ( فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُ خُوَارٌ فَقَالُوا هَـٰذَا إِلَـٰهُكُمْ وَإِلَـٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ )
دیقەتی هێز و توانای (سامری) بدەن , ( **فاخرج لهم** ) , نافەرمووێت (فصنع لهم) .
بۆیە مووسا (علیە السلام) جێی هێشت و گوێی پێنەدا و فەرمانی بە خەڵکیش کرد کەس هەقی نەبێت بەسەریەوە یان ئازاری بدات ، چونکە پەیامبەرە و دەزانێت و عیلمی هەیە ئەم سۆفیانە لە هەموو قەومێکدا هەیە : ( قَالَ فَاذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِي الْحَيَاةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ) ..

سەرەتای سۆفیزم لە ئاینی جوودا , لەو کاتەوە دەستی پێکرد . کە جووەکان شوێن مووسا (علیە السلام) نەکەوتن و 40 ساڵ لە بیابان دا بوون ، پاش مووساش (علیە السلام) هەر شوێن ئاینی خودا نەکەوتن . هەتا ئێستاش ئاین لە حاخامەکان وەردەگرن .
ئاینی جوو ئاینێکی سۆفیزمە , ئاینەکەیان لە دیدی حاخامەکانیان وەردەگرن . هەر حاخامێك مشاهەدەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئاین و خودا , پێی دەڵێن (تلمود) , سەیری تەلموودەکان بکە , دید و بینین و مشاهەدەی حاخامەکانە لەگەڵ دەقەکانی تەورات تێکەڵیان کردووە .

لای کڵێساش هەمان شتە بەڵام ئەمان بە خەڵوەت نییە ، بەڵکو بە (لاهوت)ـە . ئەم لاهوتەش یەکەم جار (پۆلس) هێنایە ناو ئاینی مەسیحیەوە . شێخانی تەریقەتی مەسیحی پێیان دەڵێن (قدیس) , سەیری مێژووی کڵێسا بکەن ئەم قدیسانە وەك شێخانی تەریقەتی لای خۆمان کەراماتیان هەبووە .
لە ڕۆژئاوا ئەم شێخانی تەریقەتە ناسراون بە ( sint ) ,. بۆ نموونە ئێمە لە سەری ساڵدا , (سینتکلاس) بەکاردەهێنین لە ئەسڵدا ( sint niklaas ) , واتا پیاو چاك یان قدیس یان شێخی تەریقەت ( نیکلاس ) سەیری ناوی کڵێساکان بکەن لە جیهاندا یان بە ناوی قدیس یان سینت فلانەوەیە . تەنانەت زۆر شوێن لە ڕۆژئاوا وەك گوند و شارۆچکە و شەقامەکان بە ناوی ئەو شێخانی تەریقەتەوەیە ( سینت ...... )

کاتێك ئاینی ئیسلام بڵاو بووەتەوە ، ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەلاتی (ڕۆم) دا بوون . ڕۆمەکان خۆیان خاوەنی هیچ ئاینێك نەبوون و هەموو شتێکیان پەرستووە (وثني) بوون . لەگەڵ ئەوەشدا گاور و جوولەکە و جۆرەها بت پەرست و ئاینی تر بوون لە ژێردەستی ڕۆمدا بوون .
یان ناوچەی ژێر دەستی فارس بوون , ئاینی ڕەسمیان (ئاگرپەرست) بون لەگەڵ ئاینە کۆنەکانی تر دا وەك بابلی و سۆمەری و زەردەشتی و.. هتد ... لە ژێر دەسەلاتی فارس دا بوون .

لێرە دا ئەم ئاینزادە کۆنانە و ئەوانەی حەزیان لە عیرفانە , ئاینی تازەی ئیسلامیان وەرگرت لەگەڵ تێکەڵ کردنی ئاینە کۆنەکانی پێشتر کە هەیان بووە .

ئەگەر یەکێك شارەزای ئاینی سۆفیزم نەبێت و لێکۆڵینەوەی بۆ نەکردبێت زەحمەتە تێبگات . بۆیە لێرە من نموونەی کوردەواری خۆمان دەهێنمەوە لەبەرچاوە و زیاتر تێدەگەن لە باسەکان .
ئەگەر سەیری تەریقەکانی تصوف بکەین لە ناوچەکانی هەورامانی تەخت و بیارەش زیاتر ئاینی ئیسلامیان تێکەڵی (زەردەشتی) کردووە ، چونکە ئەو ناوچەیە کانگای زەردەشتیەکان بووە پێش هاتنی ئیسلام .

ئەگەر سەیری تەریقەکانی تر بکەین , هەر ناوچەیەك خورافات و چیرۆکی کۆنی ئەو ناوچەیەی تێدا بەدی دەکەین تێکەلاوی کەراماتی شێخەکانیان یان تەریقەتەکانیان کراون . ئەم حاڵەتەش قیاس بکەن بۆ هەموو تەریقەتەکانی سۆفیزم لە هەموو جیهان دا .

لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێش :
کەواتا پێغەمبەر (ﷺ) بۆچیٚ ئەم زەمەنەی 1250 ساڵەی بە خێر وەسف کردووە , کە ئەم تەریقانەی تصوفی تێدا دروست بووە ؟..
وەڵام :
وەك باسمان کرد دەروێشەکان خەڵکی عیرفانین , پاك و دڵسافن ، ئەو کەسانە هیچ زیانێکیان نەبووە بۆ ئاینی ئیسلام . سەیری مێژووی 1250 ساڵ بکەن . هیچ شێخێکی تەریقەت و دەروێشەکانی دژایەتی ئاینی ئیسلامیان نەکردووە وەك شیعەکان .. هەوڵیان نەداوە ببن بە خاوەنی دەوڵەت و سوپا ئامادە بکەن بۆ لێدانی خەلافەتی ئیسلامی

بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم دەروێشانە سەربازی خیلافەت و دەوڵەتی ئیسلامی و موجاهیدان بوون . پارێزگاریان کردووە لە دەسەڵاتی ئیسلامی .
کابرای دەروێشی داماو بە هەڵە خودا دەپەرستێت تاوانی نیە . تاوانباری مەزن شێخی تەریقەتەکەیەتی نەك دەروێشێك . لێرەدا دەوەستین و لە بەشەکانی تردا دەگەڕێینەوە بۆ دەروێشەکان و شیعەکان .

**سێیەمیان** : سێیەم گروپ کە دروست بووە لە ماوەی ئەو **1250** ساڵە دا کە بە خێر ناوبراوە , ( معتزلة )کانن .

( معتزلة ) لەسەر وەزنی ( مفتعلة ) ، ئەسڵی وشەکە لە ( عزل ) هاتووە . (عزل)یش واتا خۆ جیاکردنەوە و خۆ دوور خستنەوە بە ئیرادەی خۆت . ( وَنَادَىٰ نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا ) ..
خەڵکی دەڵێن بۆیە پێیان دەڵێن (معتزلة) , چونکە ئەمان نەچونەتە مەجلیسی (حەسەنی بەصری)ـەوە و لە مەجلیسەکەی دەرچوون .

ئەم بۆچوونە و ئەم قسەیە زۆر هەڵەیە ، چونکە بناغەی دنیا لەسەر بیر و ڕای جیاواز دروست بووە . خودای خاوەن دەسەڵات پەیامبەرانی ناردووە لە ڕێگای ئەو بیر و ڕا جیاوازانەوە (**الله**) و خالق بدۆزنەوە و بە گوێرەی یاسا و ڕێسا ئیلاهیەکان بژین .
(معتزلة) لە هەموو زەمانێکدا هەبوون پێش ئیسلامیش . ئەم جۆرە کەسانە ئاین بە ئەقڵ و واقیع بینی وەردەگرن . ئەوەی ئێمە شارەزاین لە دوای نوحەوە (علیه السلام) , ئەو کەسانە بە خاوەنی (فەلسەفە) ناسراون .

فەلسەفە لە ئەسڵ دا بەشێکە لە دین . هەوڵ دەدات بیر و هۆشی خەڵکی بکاتەوە و داوایان لێدەکات ( **لعلكم تعقلون** ، **تذكرون** ، **تتفكرون** .. )
فەیلەسوفە کۆنەکانی (یۆنان) داواین لە خەڵکی کردووە . بگەڕێن بە دوای خودا دا ، چونکە فرە خودایی هێندە زۆر بووە هەموو شتێك پەرستراوە . ئەوانیش لە شێوەی پرسیار داوایان لە خەڵکی کردووە بگەڕێن بە دوای (خالق) دا ، وە خالقی کەون دارێك بەردێك بتێك ئاژەڵێك یان.. هتد ... نییە کە ئەمان پێی دەڵێن (خوداوەند) .
لە بەرامبەریش دا وەڵامی خەڵکیان نەداوەتەوە ، بۆ ئەوەی خەڵکەکە خۆی خودای خالق بدۆزێتەوە .

وەك دەزانن بتپەرستی و فرە خودایی لە پێش ئیسلامەوە لە هەموو دنیا دا هەبووە . (عێراق)یش لانکەی ئەو فرە خودایيە بووە دوای نوح (علیه السلام) , یەکەم شارستانی کۆن لە دنیا دا , لە (بابل)ەوە دروست بوو ، پاشان شارستانیەکانی تر سەریان هەڵدا لە (عێراق)دا .
کاتێك سوپای ئیسلام سوپای فارسی دەرکرد و ئاینی ئیسلام هاتە عێراقەوە . ئەو خەڵکە بت پەرستە و فرە خودا کۆنانە هاتنە ناو ئاینی ئیسلامەوە . ئەم کەسانە تێبینی و سەرنج و ڕەخنەیان هەیە لەم ئاینە نوێیە و بەراوردی دەکەن لەگەڵ بیر و ئاینە کۆنەکانیان دا .

بۆیە پێیان دەگوتن ( معتزلة ) , فکر و دیدی ئەمانە جودا بووە لەگەڵ ئاینی نوێ دا و دوور بوون لە دینی نوێ وە ، نەك دوور بن لە مەجلیسی حەسەنی بەسریەوە .

ئەم خەڵکانە هەمیشە لە بەراورد دا بوون لە نێوان ئاینە کۆنەکانی باو باپیرانیان و ئاینی نوێ دا .
سەرەتای نوسینەوەی حەدیسەکان لێرەوە دەستی پێکرد .. سەرەتای تەفسیری قورئانیش لێرەوە دەستی پێکرد .
واتا پاش 200 بۆ 300 ساڵ دوای بلاو بوونەوەی ئاینی ئیسلام . ئینجا ئیمامی (بوخاری و مسلم) هاتن حەدیسیان کۆکردەوە . پاشان ئیمامی (طبري) هات تەفسیری قورئانی کرد بۆ یەکەم جار .
چونکە کێشمەکێشی گەورە هەبوو لە نێوان ئاینی نوێ و ئاینە کۆنەکان و خاوەن فکر و فەلسەفەکان .
بۆ ئیسپات کردنی بەڵگە بۆ بەهێزی ئاینی نوێ ، حەدیسەکان کۆکرانەوە و شیکاری و قورئانیشیان لە دیدی خەڵکانی پێش خۆیان نووسی ..

لێرەدا دەبێت بزانین :
ئەم کارانە بە چاودێری خەلیفە و دەسەڵاتی ئیسلامی کراوە . دەتوانیت ناوی بنێیت (دیبەیت) بە زمانی ئێستامان .
خەڵکی کۆ دەبوونەوە لە جێگایەك و هەر یەك لە زانایانی ئاینی نوێ کە ئیسلامە و ئاینی کۆن دیبەیتیان دەکرد .
زۆرترین جاریش لە کۆشکی خیلافەت یان والی دەکرا , بە ئامادەبوونی زانایانی هەردوو لا .
لە ساڵی 300ی کۆچیەوە و دوای فیتنەی (ئیمام احمد) ، کێشەی ئاینە کۆنەکان و ئاینی نوێ بەرەو کاڵ بوون و نەمان دەچوو . چونکە سێ سەدەیە ئاینی نوێ هەیە و خەڵکی زیاتر تێدەگەیشتن راستیەکان لای کێیە ؟..

کەواتا کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەم زەمەنی 1250 ساڵە بە خێر ناو دەبات لە حەدیسەکەی (حذيفة)دا . ئەمە موعجیزەیەکی گەورەیە و ئێمە ئێستا دەیبینین و دەزانین .

گرنگیی ئەم باسە لێرەدایە :
(معتزلة) تا ئێستاش هەر هەیە و ماوە . ئەم معتزلانە کاریان ڕووخاندنی دەوڵەتی ئیسلامی نەبووە ، چەکیان هەڵنەگرتووە و شەڕ بکەن . بە پێچەوانەوە زۆربەی زۆریان کاتی جیهاد وەك دەروێشەکان چەکیان هەڵگرتووە و بەرگریان لە ئاینی ئیسلام کردووە .

ئێستا بە کورتی باسی (زەمەنی سێیەم) دەکەین کە پێغەمبەر (ﷺ) بە زەمەنی خێر وەسفی کردووە بۆ (حذيفة) .
ئەم زەمەنە تەقریبەن لە ساڵی 50 هەتا 1300ی کۆچی بووە . لەم زەمەنەدا ( 3 هێز ) هەبووە :
( شیعە , سۆفی , معتزلة ) .
**شیعە** : هەمیشە هەوڵی داوە دەوڵەتی ئیسلامی بڕوخێنێت و خۆی ببێت بە جێگری ئاینی ئیسلام .
**سۆفیەکان** : خەڵکێکی خاوەن دین و تەقوا و زوهد ناخ پاك بوون .
**معتزلة** : خاوەنی ئەقڵ و هزر و فکر بوون .
ئەم سێ هێزە بە درێژایی 1350 ساڵ ,واتا هەتا ئێستامان , لە کێشمەکێشدان لەگەڵ ئەسڵی , ئاینی ئیسلام دا .

لە زەمەنی خێر دا واتا 1250 ساڵدا . دەسەڵاتی ئیسلامی هەبووە خاوەنی چەك و پارە و سەرباز بووە نەیان هێشتووە شیعە ئاینی ئیسلام لەناوبەرێت .

سۆفی و موعتەزیلەکان هەمیشە کێشمەکێشیان هەبووە . لە هەموو زەمان و کاتێك دا زانایانی ئیسلامی بە توانا ڕووبەڕوویان بووەتەوە و دیبەیت و مناقشەیان لەگەڵ کردوون لەسەر بەڵگەکانی خۆیان و بەرامبەریش .
ئەگەر کێشەکان گەورە بووایە و لەناو خەڵك و مزگەوتەکان دەرچووایە . دەسەلاتی دەوڵەت وەك خەلیفە یان والی زانا و گەورەکانی هەردوو لایان بانگ دەکرد بۆ کۆشك و خەڵکی شارەزایان بانگ دەکرد .

گوێیان لە بەڵگەی هەردوو لایان دەگرت . جاری وا هەبووە چەندین شەویان پێ چووە . پاش تەواوبوونی دیبەیتەکە خەڵکی شارەزا و خەلیفە بڕیاریان دەردەکرد کامیان راستن و بەڵگەی کامیان بەهێزترە .
خەڵکی جاهیل و نەزان و دژە ئیسلام دەڵێن ئاینی ئیسلام دایم خەریکی شەڕ و خیلافات بوون . بێ ئاگان لەوەی ئاینی ئیسلام کاتێك بلاو بووەتەوە بەرەنگاری شیرك و کفر و بت پەرستی هەزاران ساڵ پێش خۆی بووەتەوە .

چۆن و کەی و چەندی دەوێت هەتا ئەو کفرانە راست دەکرێتەوە ؟.. پاشان فکر و تێگەیشتنی مرۆڤ هەمیشە لە گۆران دایە . ئەم کێشە کێشە نەك لە بواری ئاینی , بەڵکو لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەردەوامە .
گرنگترین خاڵ ئەوەیە دەسەلاتی ئیسلامی هەبووە وەك چەك و سەرباز بەرگری کردووە لە ناوخۆ و دەرەوە و بۆ ماوەی 1250 ساڵ بەرگریان کردووە ..
زانا و کەسی بە توانا هەبووە دیبەیتیان کردووە و وەلامی فکری جیاوازیان داوەتەوە .

ئەمە ئەو دوکەڵەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی دەکات . لە هەموو کات و زەمانێك دا دوکەڵ هەبووە ئاگری شەڕ یان فکر هەڵگیرساوە ، ئەگەر بە چەك بوایە دەسەلاتی دەوڵەتی ئیسلامی ئاگرەکەی کوژاندووەتەوە .
ئەگەر بە فکریش بوایە زانایان و خەڵکی شارەزا ئاگریان کوژاندووەتەوە . کاتێکیش دەڵێن ئیسلام بووە بە سەدان پارچەوە هەمووی ئاسار و شوێنەواری ئاگرەکانە و خەڵکی لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی جیاجیای بۆ دوکەڵی ئاگرەکە کردووە لە دوورەوە .

**قۆناغی چوارەم** : ئێستا با بێین بۆ زەمەنی چوارەم . (حذیفة) دەپرسێت : ئایا دوای ئەو خێرە دوکەلاویە شەڕ هەیە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت : بەڵێ
( دُعَاة على أبواب جهنَّم . مَن أجابَهُم إليها قذَفُوه فيها )
ئەو زەمانە بە بانگەشە بۆ دەرگاکانی (جهنم) باسدەکات . ئێستا ئێمە 101 ساڵ دوای ئەو زەمانەین و با بە چاوی خۆمان شیکاری بۆ بکەین.

کێ بو,ە هۆکاری ڕو,خانی دەوڵەتی عوسمانی ؟.. واتە ڕووخانی ئەو زەمانەی پێغەمبەر (ﷺ) بە خێرێکی دوکەلاوی باسی کردووە ..
ئایا شەریفی مەکە و ئال سعود شۆڕشی نەتەوە پەرستی و ڕەگەزپەرستی عەرەبیان هەڵ نەگیرساند و نیوەی دەوڵەتی خیلافەی عوسمانیان نەڕووخاند ؟..
ئەگەر ئەمانە پشتگیری دەوڵەتی عوسمانیان بکردایە . ئایا دەوڵەتی عوسمانی سەر نەدەکەوت و ئێستا دەسەلاتی ئیسلام زلهێز نەدەبوو لە بری ئەمریکا ؟..

پاش نەمانی دەوڵەتی خیلافەت , (ئال سعود) بوون بە دەمڕاستی ئاینی ئیسلام و موسوڵمانان لە جیهاندا .
یەکەم کاریان ئەوە بوو هەرچی سۆفی و دەرویش هەبوو لە دوورگەی عەرەب نەیانهێشتن .
لە کاتێکدا مەنهەجی سۆفیزم زۆر لە ئاینی ئیسلام کۆنترە و هەموو گەلان سۆفیزمیان تێدا بووە . لەوەش گرنگتر دەسەڵاتی خیلافەتی ئیسلامی بۆ ماوەی 1250 ساڵ نەهاتوون سۆفیەکان بنەبڕ بکەن .

خۆ ئەوانیش دەسەڵاتی سەربازیان هەبووە و دەیانتوانی هەمان کاری ئال سعود و وەهابیی لۆرانسی بکەن . بۆچی ئەو کارەیان نەکرد ؟..
لێرەدا سەلەفی و سەلەفیزم دەکەونە ژێر لێکۆڵینەوە .
چونکە هەر سەلەفیەك دەڵێت سەلەفیم ڕاست ناکات و ناشزانێت سەلەف مانای چییە ؟..
سەلەف واتا ئەوانەی پێش خۆمان . لێرە دا دەپرسین کام لەوانەی پێش (ئال سعود) بە درێژایی 1250 ساڵ بەو شێوەیە سۆفیەکانی بنە بڕ کردووە ؟..
لەوەش گرنگتر : ئەم پرسیارە بێ وەلامەیە لە سەلەفیەکانم کردووە هەتا ڕۆژی قیامەت وەڵامی نییە ئەمە پرسیارەکەیە :

سەلەفی کەی دروست بوو ؟..
چونکە هەمو فکریك و کۆمەڵێك لە جیهان دا دەزانن کەی و چۆن دروست بوون و ئەو ناوەی بۆیان دانراوە ، کێ و کەی ناوی لێنان ..

کەواتا دەبێت پێمان بڵێن : سەلەفی یان سەلەفیەت کێ یەکەم جار ئەم ناوەی دانا و گوتی من سەلەفیم و خەڵکیش شوێنی کەوتن و بوون بە کۆمەڵێك و ناویان لێنرا کۆمەڵی یان هاوڕێیانی یان هاوەڵانی یان ڕەوتی سەلەفی ..

کەواتا دەبێت بەڵگە هەبێت کێ یەکەم جار پێی گوترا فلان سەلەفییە و دوای ئەو خەڵکیش شوێنی کەوتن و گوتیان ئێمە شوێنکەوتوی فلانین فلان ساڵ ڕەوتی سەلەفی دامەزراند ؟..

بۆ نموونە : اشعری یان قادری یان نازی یان چەپەکان یان شیوعی یان سەرمایەداری یان.. هتد ... دەتواندرێت بزانین کەی و چۆن دامەزران و کێ ئەم ناوەی لێنان و بوون بە ڕکخراو یان ڕەوت یان.. هتد ...
تەنانەت هەموو ئامێرێك ئەسڵی هەیە , دەزانین تەلەفۆن (گراهام بێل) داینا , کارەبا (ئەدیسۆن) و.. هتد ...
مەعقول نییە کۆمەڵێکی ئاینی کەس نەزانێت کەی دامەزراوە و لە کام مزگەوت کۆ بوونەوە و ئەم ناوەیان بۆ خۆیان هەڵبژارد .

ئەمانە درۆ دەکەن نە سەلەفن و نە شوێن سەلەف کەوتوون و نە دەزانن بۆچی سەلەفین و کێ یەکەم کەس ئەم ناوە و ئەم ڕەوتە و ئەم مەنهەجەی بۆ دانان .

گەر دەڵێن وا نیە , فەرموو هیچ نەبێت وەڵاممان بدەنەوە ، ئێستا بڵێن شیعە دەزانین کەی دامەزراون . گسکی کارەبایی دەزانین کەی و کێ دروستی کرد . مەعقول نیە مەنهەجێك بڵێت بەس ئێمە دەچینە بەهەشت و باقتیات بۆ ئاگرن . نەزانێت کێ یەکەم جار گوتی ئێمە سەلەفین و خەڵکیش گوتیان ئێمەش سەلەفیین .

ئەگەر بڵێین (تصوف) چۆن و کەی هاتە ئیسلامەوە ؟.. وەڵامی هەیە و دەزانین سەرەتاکەی لە باشووری عێراقەوە دامەزرا ..

(حلاج) ساڵی 95ی کۆچی لە دایك بووە ، یەکەم کەس بووە مەنهەجی تصوفی دامەزراند .

ئەی تۆی سەلەفی بۆ نازانیت بۆچی سەلەفییت و کێ یەکەم جار گوتی من سەلەفیم و خەڵکی بەو ناوەوە کۆکردەوە؟

خۆ اهلی طصوف زۆر لە تۆی سەلەفی کۆنترە . ئەوان لە سەدەی یەکەمی کۆچیەوە دروست بوون .

تۆی سەلەفی 100 ساڵە (لۆرانس) دروستی کردوون و ناوی لێناون سەلەفی .

لێرەدا دەپرسین :

ئایا ئەم (ئال سعود)ـە و سەلەفیەکان لە جیهاندا کامیان وەك سەلەفی صالحی پێش خۆیان دانیشتووە دیبەیت و مناظرات بکات لەگەڵ سۆفیەکان دا ؟..

لێرەدا خاڵی گرنگ ئەمەیە :

دەرویشی سادە و عەوام نازانن سۆفیزم چیە و ئاینی ئیسلام چیە وەك کتێب و سەرچاوە .. ئەمانە شوێن قسە و کەراماتی شێخەکانیان کەوتوون .

بۆیە دەبێت دیبەیت لەگەڵ سەرە گەورەکانیان بکرێت و بە بەڵگەی کتێب و سەرچاوەکانی خۆیان گفتوگۆ بکرێت و بەراورد بکرێت لەگەڵ قورئان و سونە . وەك چۆن 1250 ساڵی پێش (ئال سعود) دیبەیت دەکرا .

ئێستا دەپرسین سەلەفیزم چیان کردووە ؟.. دەبووایە ئێستا هیچ نەبووایە بە هەزاران کەناڵیان هەبووایە بۆ پووچەڵ کردنەوەی ئاینی سەلەفیزم ، چونکە تەریقەکان بە هەزارانن و دەبێت تەرجمەش بکرێت .

بۆ ئەوەی زمانە جیاجیاکانی موسوڵمانان ئەسڵی سۆفیزم بزانن چییە ؟..

با بێینە سەر کوردستان . کێ دەتوانێت کتێبی یەك مامۆستای سەلەفیم پیبڵێت . شیکاری کردبێت بۆ یەکێك لە تەریقەکانی سۆفیگەری بە گوێرەی کتێب و بەڵگەکانی ئەو تەریقەیە ؟..

باوەڕتان هەبێت هیچیان نازانن سۆفیزم چیە وەك کتێب و سەرچاوەی بەرامبەریان . بەس ئەوە دەزانن بڵێن ئەمانە موشریك و قەبر پەرستن .

تەنانەت هیچ کەناڵێکیشیان نیە لە یوتوب . یەك کەناڵ هەیە ( Kurd Sufism )[1] ئەویش هی منە کاتی خۆی دامناوە کە دراسەی سۆفیزمم دەکرد .

---

لینکی کەناڵی ( Kurd Sufism )[1] :

https://www.youtube.com/user/bahawas1

ئێستا لەم حەدیسە تێ دەگەین : ( دُعَاة على أبواب جهنَّم . مَن أجابَهُم إليها قذَفُوه فيها ) ..
دوژمنی سەرەکی سەلەفیزم سۆفیزمە . بەڵام وەك سەرچاوە و بەڵگە هیچ شتێکیان نەکردووە بۆ ئەوەی دەروێشی عەوام ببینێت شێخەکەیان دوای باطل کەوتووە و دەروێشەکەش واز لە شێخەکەی و تەریقەکەی بهێنێت .

بەڵێ بەڕێزان (سەلەفی صالح) پێشتر لە ساڵانی 150ی کۆچی دا سۆفیەکانیان بینیوە و هەتا جەنگی جیهانیی یەکەم کەس نەهاتووە بنەبڕیان بکات . هاتون دیبەیتیان لەگەڵ شێخەکانیان کردووە .
چونکە لوتکەی کفر و شەیتان پەرستی لای شێخەکانیان و سەرچاوەکانیانە , نەك لای دەروێشێکی عەوام . بەڵام ئەم سەلەفی نا صالحەی ئێستا .
چاویان لە سەلەفی پێش خۆیان نەکردووە بە فەرمانی (لۆرانس) هاتوون ڕەشە کوژیان لەم سۆفیانە کردووە . چونکە ئەمانە مجاهید بوون في سبيل الله , وەك چۆن لە ماوەی 1250 ساڵدا مجاهید بوون لە دەوڵەتی خیلافەت دا .

حەدیسەکەی خۆشەویست (ﷺ) ڕوونە : ( دُعَاة على أبواب جهنَّم . مَن أجابَهُم إليها قذَفُوه فيها ) ..
ئەم سەلەفیە نا صالحانەی (لۆرانس) , هاتن دەروێشە مجاهیدەکانیان کوشت بە ناوی شیرك و بیدعە و قەبر پەرستیەوە .

وەك کورد , تەحەددای هەموو مامۆستایانی سەلەفی دەکەم یەك کەسیان کتێب و لێکۆڵینەوەی هەبێت بۆ یەکێك لە تەریقەکان , گرنگ نیە کام تەریقەتە : قادری یان نەقشبەندی یان رفاعي ... چونکە ئەم سیانە بڵاون لەناو کورد دا . فەرموون ئەوە عەرز و ئەوە گەز .. یەك کتێبم بۆ بهێنن مامۆستایەکی سەلەفی کورد دیراسەی کتێب و سەرچاوەی یەکێك لەو سێ تەریقەتەی کرد بێت و بە بەڵگەی شەرعی کتێبی بەرامبەری پووچەڵ کردبێتەوە .
کە هیچ بەرهەمێکتان نیە . چۆن دەڵێن سۆفی شیرك دەکات و خەڵکی بۆ جەهەنەم دەبات ؟..

باو باپیرانی داماومان نەخوێندەوار بوون . ئێستاش خەڵك خوێندەوارە . جاران و ئێستاش خەڵکی بەوە هۆشیار دەکرایەوە .
لەسەر کتێب و سەرچاوەی بەرامبەر قسە بکەیت . کاتێك خەڵکەکە دەیانزانی ئەو سەرچاوانە دوورن لە قورئان و سونە خەڵکی خۆی لە شێخەکە دوور دەکەوێتەوە .
ئادەی یەك مامۆستای سەلەفی کوردم پێ بڵێن کەناڵی هەبێت لە یوتوب شیکاری سۆفیزمی کرد بێت وەك بەراورد کردنی سەرچاوەی بەرامبەر لەگەڵ قورئان و سوننە دا ؟..

ئەم سەلەفیانەن کە لەبەر دەرگای جەهەنەم دان و موسوڵمان بەرەو جەهەنەم دەبەن .
( دُعَاة على أبواب جهنَّم . مَن أجابَهُم إليها قذَفُوه فيها ) ..
سەرەتا مجاهیدانیان کوشت بە فەرمانی (لۆرانس) . ئێستاش ئەوەتا تەحەدداکان لەبەر چاوتانە .
ئەم سەلەفە نا صالحانە با بتوانن ئەسڵی ناویان بهێنن یان ئەو کتێب و کەناڵەی باسم کردووە .

ئێستا با بێینە سەر (شیعە) ، ئەمانە 1350 ساڵە بوونیان هەیە . پێشتر باسکرا ئەم شیعانە هەوڵیانداوە دەوڵەتی ئیسلامی لەناوبەرن ، هەموو جار دەوڵەتی ئیسلامی دەوڵەتە دروستکراوەکەی شیعە یان ئەو فیتنەیەیان لەناو بردووە کە دوکەڵی دروستکردووە .
هەمووان دەزانین لە ساڵی 1979وە (خومەینی) ئەم کۆماری ئیسلامیەی دامەزراند . ئێستا ساڵی 2019یە ، واتا 40 ساڵە (شیعە) دەوڵەتی هەیە .

لە ماوەی ئەم 40 ساڵە دا , دەسەڵاتی (ئێران) گەیشتووەتە (عێراق و ئەفغانستان و سوریا و لوبنان و یەمەن ) .
دەوڵەتێکی زلهێزە و ئیمپراتۆریەتی کیسرای فارسی زیندوو کردووەتەوە .

لە بەرامبەریش دا , (سەلەفیزمی وەهابی) , ئاینی سەلەفیزمی لە هەموو جیهانی بەناو ئیسلامی دا بڵاو کردووەتەوە .
بەڵام نە زلهێزە و نە هیچ دەوڵەتێك حسابی بۆ دەکات . بەڵکو کۆیلەن و وەك مانگا دەیدۆشن .

شوێنکەوتەکانیان لە دەرەوەی (سعودية) بەهەمان شت کۆیلەن و ئاینی کۆیلایەتی بڵاو دەکەنەوە .
زائیدەن سووك کردن و لێدانی هەموو کەسێك بە ناوی ئاینەوە , گوایە سەلەفیزم هەڵگری ئاینی ڕاستە .
1979/12/25 , (ڕووس) چووە (ئەفغانستان)ەوە ، ئاینی سەلەفیزم بە ناوی جیهادەوە شەڕی کرد لەبری ئەمریکا و (قاعیدە)یان بۆ دروست کردین .

هەر هەمان ساڵ لە 1979/11 (خومەینی) هاتە ناو ئێران و کۆماری ئیسلامیی ئێرانیان دروست کرد .
لێرەدا بەراوردی دەوڵەتێکی بێهێزی شیعە بکەن تازە دروست بووە لەگەڵ دەوڵەتی (لۆرانس) کە 60 ساڵ پێش ئەم دەوڵەتە لاوازەی شیعە هەیە .
لۆرانسیەکان شەڕ دەکەن لەبری ئەمریکا , بەرامبەر ڕووسیا بە ناوی جیهادەوە .

پاش 11 مانگ لە داخڵ بوونی (خومەینی) لە 1980/9 شەڕی ( ئێران و عێراق ) دەستی پێکرد .
ساڵی 1988 شەڕی (ئێران و عێراق) وەستا , وە ساڵی 1989 شەڕی ( ڕووس و ئەفغان ) راوەستا .

(سعودیە) شەڕ دەکات لە (ئەفغانستان) لەبری (ئەمریکا) .
(ئێران) شەڕ دەکات لەگەڵ (عێراق) بۆ ئەوەی ( کربلا و نجف ) بەدەست بهێنێت .
چونکە کۆماری ئیسلامی ئێران بێ (نجف و کربلا) کامل نابێت .

هەتا ساڵی 2003 کۆماری شیعە و دەسەڵاتی شیعە سفر بوو .. ئەویش بەهۆی بەهێزی (صدام حسێن)ـەوە بوو .
پاش ڕووخانی (صدام) , کۆماری شیعە کامل بوو و کەربەلا و نەجەفیان دەستکەوت . پێگەی شیعە و ئێران لە هەموو دنیادا فراوان تر بوو ، بە تایبەت لەو ولاتانەی شیعە مەزهەبیان تێدا بوو .

مەبەست لەم مێژوو گێرانەوەیە ئەوە بوو , لە ماوەی 14 ساڵدا , واتا لە 2003 وە . دەسەڵاتی سعودی بە قێزەونترین شێوە ئاینی ئیسلامی شێواند . چونکە ئەو مجاهیدانەی (ئەفغانستان) لە دوای جەنگی ئەفغانستان .
ویستیان حوکمی خودا بگێڕنەوە و دەوڵەتی ئیسلامی دروست بکەن . بەلام تووشی شۆك بوون کە بینیان دەوڵەتی سعودی بە ناوی خودا و جیهادەوە شەڕی پێکردون لە جیاتی ئەمریکا بەرامبەر بە ڕووسیا .

بۆیە (سعودیة) بەهەموو شێوازێك ویستی (قاعدە) و جیهاد و فکری جیهادی بنەبڕ بکات بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئیسلامی دروست نەبێت . باشترین چارەسەریش ئەوەیە ئاینی ئیسلام و جیهاد ناشرین بکرێت .
خۆشتان دەبینن چۆن (داعش) دروست کرا و چۆن ئیسلامیان ناشرین کرد لە هەموو جیهان دا .
لە هەمان کاتدا (شیعەی رافیزە) توانیان ئیمپراتۆریەتی فارسی زیندوو بکەنەوە و ببن بە زلهێزێکی نێودەوڵەتی لە هەموو بوارەکان دا .

پرسیاری سەرەکی ئەمەیە :
ئایا ئەو زەمەنە خێرە دوکەلاویە بمایە ، (ئێران) دەیتوانی بەم شێوەیە ببێت بە زلهێز ؟..
ئایا دەوڵەتی ئیسلامی ڕێگای دەدا موسوڵمان بە ناوی جیهادەوە شەڕ بکات لەبری دەوڵەتێکی تر ؟..
کەواتا کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئەوانە دەکات لەبەر دەرگای دۆزەخدان و بانگەشەی خەڵکی دەکەن بۆ دۆزەخ ( دُعَاة على أبواب جهنَّم ) .. ئایا مەبەست ئاینی (لۆرانس) و سەلەفیزم نییە ؟..
ئایا لە ماوەی 1250 ساڵی خێری دوکەڵاوی دا ڕووداوی لەو شێوەیە دروست بووە ؟..
ئایا موسوڵمانیان بە کوشتداوە و شەڕیان پێکردووە لەبری دەوڵەتێکی تر ؟..
ئایا هاتوون ئاینی ئیسلام ناشرین بکەن و داعشێك دروست بکەن ؟..
ئایا ڕێگایان داوە ئاینی (شیعە) فراوان بێت و ببن بە زلهێز لە جیهاندا و بێدەنگ بن ؟..
کەواتا کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) وەسفیان دەکات هاوزمان و هاونەتەوەی خۆمانن ئایا ئەوە (ئال سعود) و (ئال نهیان) نین ؟.. ( هُمْ مِن جِلدَتِنا ويتكلَّمون بألسِنتِنا ) ..

لە بەرامبەریشدا ئایا (سعودیە) هیچ کەناڵی تەلەفزیۆن و ماڵپەڕ و پێگەی ئەلکترۆنی هەیە هیچ نەبێت (شیعە) و ئاینی شیعە بە موسوڵمانان بناسێنێت ؟..

لێرە دا دەبێت لەسەر وەرچەرخانێکی گرنگ قسە بکەین ئەویش ئینتەرنێتە .
هەتا ساڵی 2000 هەموو فکر و هەموو ئاین و بۆچوونێك نیو شاراوە بوو . بەڵام لە 2000 ەوە ئینتەرنێت هاتە ئاراوە هیچ شتێکی شاردراوە بوونی نەما . هەموو شتێك هاتە بەر چاوی خەڵکی .
هەموو شتێکیش هاتە ناو هەموو ماڵەکانەوە بمانەوێت و نەمانەوێت دێتە بەردەستمان و بەر چاومان .
کاری ئینتەرنێتیش بە پارە دەکرێت . چونکە هەموو فکرێك یان هەر شتێك بتەوێت لە نێت بلاوی بکەیتەوە .
دەبێت خەڵکی پسپۆڕت هەبێت تایبەت بێت بەو کارە و سەرپەرشتیی بکات و مووچەی تایبەتیان هەبێت .
بۆ نموونە : شۆپینگ ئۆن لاین و.. هتد ...

سەیر بکەن کڵێسا و جوو و علمانیەت و بێدین و هەموو جۆرە دژە ئیسلامەکان . بێجگە لە کەناڵی گەورەی تیڤی .
بە هەزاران کەناڵیان هەیە لە ئینتەرنێت , بە نووسین و بە ڤیدیۆ بۆ لێدانی ئاینی ئیسلام .
موسوڵمان و نا موسوڵمان دەڵێن (سعودية) هەڵگری ئاینی ئیسلامە و جێگای دابەزینی وەحیە و مەکە و مەدینەی لێیە
هەمووان دەزانین دەوڵەتانی کەنداو شوێنی پارەی هەموو جیهانە .

ئەم لۆرانسیانە بە هیچ شێوەیەك نەهاتوون کەناڵی تایبەتی تیڤی بکەنەوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو هەموو چەواشەکاریانە
نەهاتوون پارە سەرف بکەن و خەڵکی شارەزا دانێن لە ئینتەرنێت بە گشتی ..
بە دەنگ و ڕەنگ و نووسین وەڵامی ئەو هەزاران چەواشەکاریانە بدرێتەوە لە هەموو بوارەکاندا . بەڵام ئامادەن نرخی
نەوت دانەبەزێت بۆ ئەوەی نەوت گران نەبێت لە ڕۆژ ئاوا کاتێك ئەمریکا هەڕەشە لە جیهان دەکات .
ئەم سەلەفیزمە لۆرانسیانە دەرهێنانی نەوت دەکەن بە دوو هێندە .

ئەم شۆڕشی ئینتەرنێتە ڕاستی حەدیسەکەی خۆشەویست (ﷺ) دەسەلمێنێت کە زەمانی شەڕی دوای خێری دوکەڵاوی
ئەم عەرەبە پێ پتیانەن . ( هُمْ مِن جِلدَتِنا ويتكلَّمون بألسِنتِنا ) ..

سەیری تەربیەتی سەلەفیزم بکەن . ناهێڵن شوێنکەوتووانیان بچنە هیچ کۆڕ و کۆمەڵێکەوە دژایەتی ئاینی ئیسلامی
تێدا بکرێت بە بیانووی ئەوەی جائیز نیە تێکەلاویان بن و بۆ عەقیدە و دینەکەیان خراپە .
تاکی سەلەفی عەوامیش وەك من و تۆ موسوڵمانە و غیرەتی دەجووڵێت بۆ ئاینەکەی دەیەوێت بەرگری بکات ،
بێ ئاگایە لەوەی ئاینەکەی (لۆرانس) بۆی داناوە و شێخەکانی درۆی لەگەڵ دەکەن .

کاتێك ئەم تاکە دێتە دەرەوەی ئەشکەوتەکەی ، دەبینێت دنیایەکی زۆر جیاواز هەیە . لە ئاینەکەشی دا فێرکراوە
وەڵامیان نەداتەوە ، بەڵام ئەم کەسانە دڵسۆزن بۆ خودا و بۆ ئاینەکەیان .
کاتێك وەڵام دەداتەوە بەس (قال الله) و (قال رسوله) دەزانێت و فێرکراوە . بەرامبەریان شارەزاترن لە (قال الله) و
(قال رسوله) بەڵگەی بۆ دەهێنن بە (قال الله) و (قال رسوله) . پێی دەڵێن : ئەمەش هەر قورئان و حەدیسە و
پێچەوانەی ئەو قسانەی تۆیە .

لێرە دا کابرای سەلەفی پەنچەر دەبێت . دەگەڕێتەوە بۆ ئەشکەوتەکەی و بە مامۆستاکەی دەڵێت ئەم شتانە هەیە .
جەنابی نیاندرتاڵی مامۆستای , لە عەوامەکە کۆڵەوار ترە . ڕێنمایی دەکات نەچێتە ئەو شوێنانە .
مامۆستای نیاندرتاڵ بێ ئاگایە لەوەی ئەو شوێنانە هاتووەتە ناو هەموو ماڵێکەوە .
هەر کەس ئینتەرنێت بەکار بهێنێت بیەوێت و نەیەوێت هەموو جۆرە شتێك دێتە سەر شاشەکەی . ئەم کەسە دڵپاکە
بۆ خودا سوڵحاوە سەلەفیە , جارێك دوان سەدان.. هتد ... دەبینێت مامۆستاکانی وەڵامیان لا نیە ، خۆشی ناتوانێت و
نازانێت چۆن وەڵامی دژە ئیسلام بداتەوە .

لەم نێوانەدا کابرای دڵ پاکی بۆ خودا سوڵحاو . ئاین و خودا و ئیسلام ڕەتدەکاتەوە و بە گوێرەی بیر و باوەڕ و
ئاستی بیر کردنەوەی دەچێتە پاڵ یەکێك لەو فکرانەی دژە ئیسلام .

زۆرینەیان دەبن بە (قورئانی) . چونکە لەناو (قورئانی)دا , دەتوانێت هاوسەنگی ئاینەکەی راگرێت و بە موسوڵمانی و ئیمانداری دەمێنێتەوە . زۆریشیان دەبن بە بێدین و بێ مەنهەج .

هۆکاری ئەم پشێویە کێیە ؟.. ( دُعَاة على أبواب جهنَّم . مَن أجابَهُم إليها قذَفُوه فيها )

ئەگەر دەوڵەتێکی ئیسلامی دوکەڵاوی هەبووایە . ئایا لە هەموو بوارەکاندا خەڵکی شارەزای دانەدەنا و بەرگری لەو ڕەخنە و چەواشەکاریانە نەدەکرد ؟..

ئایا دینی سەلەفیزم بە عەمدی و بە ڕاستەوخۆ بانگەشە بۆ جەهەنەم ناکات ؟..

ئایا پارە و دەسەڵات لای ئەوان نییە و ئەوانیش خۆیان بە نەوەی پێغەمبەر (ﷺ) نازانن و بە زمانی پێغەمبەر (ﷺ) قسە ناکەن ؟.. ( هُمْ مِن جِلدَتِنا ويتكلَّمون بألسِنتِنا ) ..

ئێستا بگەڕێنەوە بۆ شەڕی ئەفغانستان .

ئایا سەلەفیزم جیهادی ناشرین نەکرد و وای لە موسوڵمان نەکرد دژی جیهاد بێت ؟..

ئایا ئومەتێکی بێ دەسەلاتی دروست نەکرد هەر کەس بێت لێمان بدات و ئێمەش نەزانین کام کۆمەڵ بۆ خودا سوڵحاوە و پشتگیری بکەین و چەکی بۆ هەڵگرین ؟..

ئایا ئومەتێکی زەلیل و خوێڕی و بێ دەسەڵاتی دروست نەکرد ئامانج و خەونمان ئەوە بێت چاوەڕوانی (مەهدی) ڕزگارکەر بین ؟..

ئایا بە حەدیسی (ئاڵا ڕەشەکان) هەموو جارێك موسوڵمان بە کوشت نادەن ؟..

ئایا ئەوانەی دوای (ئاڵا ڕەشەکان) دەکەون , دەزانن هەڵگری ئەو ئاڵا ڕەشانە سەر بە چی مخابەراتێکن ؟..

ئایا هەموو شەڕەکان بە پارەی کەنداوی سەلەفیزم ناکرێت بۆ سووك کردنی ئاینی ئیسلام ؟..

بگەڕێنەوە بۆ شەڕی عێراق ئێران:

ئایا ئەو 8 ساڵی شەڕە باشترین ئەزموون نەبوو بۆ (ئێران) بتوانێت خۆی فێری چەك دروستکردن بکات ؟..

ئایا ئێستا (ئێران) هەموو جۆرە چەکێکی قورس و سووکی نیە ؟..

ئایا حیساری ئەمریکا بۆ ئێران بۆ ئەوە بو ئێران لاواز بکات ؟..

یان بۆ ئەوەیە لە هەموو بوارەکان دا خۆی دروست بکات ؟..

ئایا ئێران لە هەموو بوارەکانی پیشەسازی دا پێویستی بە یارمەتی دەرەکی هەیە ؟..

کوردی خۆشمان دەڵێن : ئێران بێهێز بووە بەهۆی ئەو حیسارانەوە .

ئەوە مایەی پێکەنینە . چونکە ئێران بەو حیسارانە بوو بە بەهێزترین دەوڵەتی ناوچەکە .

من و تۆی سونەش بووین بە گاڵتەجاڕی هەموو دنیا . ناتوانین بچوکترین شت بەرهەم بهێنین .

ناتوانین بەرگری لە دینەکەمان بکەین و زەلیل بووین چاوەڕوانی (مەهدی) دەکەین .

بە ناوی جیهادەوە ناوچەکانمان وێران دەکرێت و هەرعاقڵ نابین .

**سەیری دینی سەلەفیزم بکەن 100 ساڵە دژایەتی (تصوف) دەکات ، دەڵێن : دەبێت جارێ ناوخۆی خۆمان ڕێك بخەین لە شیرك و سۆفیەکان نەهێڵین .**
**سەلەفی لۆرانسی , ئەی بۆچی دژایەتی (تشیع) ناکەن ؟..**
**سۆفی شیرك دەکات یان شیعە ؟.. شیعە خوداکەیان حسێن و فاطمة و عەلیە , سۆفی خوداکەی بە تەنها (الله) یە .**
**سۆفی هیچ کەناڵێکی تەلەفزیۆن و دەسەڵاتێکی سەربازی و قاسم سلێمانیان نییە .**

**مایەی شەرمەزاریە تۆی مامۆستای نیاندرتاڵی سەلەفی بەم شێوەیە یاری بە ئەقڵی ئەشکەوتی شوێنکەوتەی داماوت بکەیت بە ناوی دینەوە .**
**دوژمنی سەرەکی و موشریکی شیعە بشاریتەوە و سۆفیەکی داماوی موحدی اهلی (لا اله الا الله) لە شوێنکەوتەی عەوامت بکەیت بە دوژمنی ئاینی ئیسلام .**

**ئەم حەدیسەی (حذیفة) گەورەترین ئیعجازی نەبەویە , زۆر بە وردی باسی ڕووداوەکانی کردووە , دەبێت هەمووان لەبەرمان بێت .**
**دەبێت هەوڵ بدەین ئەو خوشك و برا سەلەفیانە دوور بخەینەوە لە دەرگاکانی جەهەنەم .**
**دەبێت خۆشمان بپارێزین لەو بانگەشانەی بەرەو دەرگاکانی جەهەنەممان دەبات :**

( كان الناس يسألون رسول الله صلَّى الله عليه وسلَّم عن الخير، وكنتُ أسأله عن الشر مخافة أن يُدرِكني.
فقلتُ: يا رسول الله، إنَّا كنَّا في جاهلية وشر، فجاءنا الله بهذا الخير، فهل بعد هذا الخير مِن شر ؟..
قال: (( نعم ))
قلتُ : و هل بعد ذلك الشر مِن خير ؟..
قال : ((نعم وفيه دَخَنٌ ))
قلتُ : وما دَخَنُه ؟..
قال : (( قومٌ يَهْدُون بغير هَدْيِي تَعْرِف منهم وتُنْكِر))
قلتُ : فهل بعد ذلك الخير مِن شر؟..
قال : ((نعم دُعَاة على أبواب جهنَّم، مَن أجابَهُم إليها قذَفُوه فيها))
قلتُ : يا رسول الله، صِفْهُم لنا ؟..
قال : ((هُمْ مِن جِلدَتِنا ويتكلَّمون بألسِنَتِنا ))
قلتُ : فما تأمرني إنْ أدركني ذلك ؟..
قال : ((تلزم جماعة المسلمين وإمامَهم))
قلتُ : فإن لم يكُن لهم جماعة ولا إمام ؟..
قال : فاعتَزِل تلك الفِرَق كلها ولو أن تَعَضَّ بأصْل شجرة حتى يُدرِكَك الموت ، وأنتَ على ذلك )

**ئێستا ئێمە لە بەشی کۆتایی حەدیسەکە داین :**
( فإن لم يكُن لهم جماعة ولا إمام ؟.. )

با ئێستا بچین بۆ بەشی کۆتایی حەدیسەکەی (حذيفة) . دەپرسێت : ئەگەر من بکەومە ئەو زەمانەوە کە خەڵکی بانگ دەکرێت بۆ جەهەنەم , چی بکەم ؟..

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت : ( تلزم جماعة المسلمين وإمامهم ) .

واتە : شوێن کۆمەڵی موسوڵمانان و پێشڕەوەکەیان بکەوە.

لێرە دا دەپرسم : لەم زەمانەی ئێمە دا کام کۆمەڵە کۆمەڵی موسوڵمانە و کێ ئیمامیانە ؟..

وەڵام : هیچ کەس .

هۆکاری نەمانی کۆمەڵی موسوڵمان و پێشڕەویان کێ بوو ؟..

پێشتر باسکراوە : شەریفی مەکە و ئال سعود بوو دەوڵەتی عوسمانیان ڕووخاند .

ئەی باشە بۆچی خۆیان نەبوون بە کۆمەڵێکی ئیسلامی و ئیمامەتی موسوڵمانان بکەن ؟..

وەڵام : ماوەیەکی زۆر خەڵکی لە جیهان ئەمانەی بە شوێنکەوتەی پێغەمبەر (ﷺ) دەزانی و لای دیندار و بێدین عولەمای سعودیە جێگای ڕێز بوون .

لە دوای شەڕی (ئەفغانستان)ـەوە ڕووی ڕاستییان دەرکەوت بۆ خەڵکی . ئەوانیش بۆ ئەوەی ڕووی خۆیان سپی بکەنەوە , سەلەفی جیهادیان گۆڕی , بۆ سەلەفی مەدخەلی .

مەدخەلی چییە ؟..

جۆرێکی نوێی سەلەفیە دروستکرا بۆ ئەوەی سەلەفی جیهادی فۆڕمات بکرێتەوە و خەڵکی دژی جیهاد بن و پشتگیری دەسەڵات بکەن لە هەر جێگایەك بن , وە پێوەریان بۆ دین گوێڕایەڵی دەسەڵات بێت , ئیتر دەسەڵات مەنهەج و فکری چییە ؟.. گرینگ نیە .. گرینگ ئەوەیە هەرکەس سەلەفی بێت , دەبێت چەپڵە بۆ وەلی ئەمر لێبدات

ئێستا با بچین بۆ پرسیارێکی تری (حذيفة) , دەپرسێت :

( فإن لم يكن لهم جماعة ولا إمام ؟.. )

واتە : ئەگەر کۆمەڵی ئیسلامی و پێشڕەویان نەبوو , من چی بکەم ؟..

ئەم پرسیارە زۆر گرنگە و هەر هەمووومان هەمان پرسیار دەکەین .

بۆ ماوەی 100 ساڵە , واتا دوای نەمانی دەوڵەتی عوسمانی , ئاینی ئیسلام و موسوڵمانان نەفەسێکیان تێدا بوو (نیوە مردووین) .

بەڵام ئێستا هێزێکی گەورەی (ئەمریکا) هاتووەتە ناوچەکەوە . بە حساب شەڕ لەگەڵ (ئێران) دەکات .

بەڵام وەك دەبینین , ساحەی ئەو شەڕە هاتووەتە (عێراق)ـەوە و ئامادەکاری بۆ دەکرێت .

بێجگە لە (عێراق) ساحەی دووەمی (ليبيا)یە . هێزی ئەمریکی دەچێتە (لوبنان و ئوردن و یەمەن)ـیشەوە .

واتە : ساحەی شەڕەکان , دەوڵەتە بەناو ئیسلامیەکانی گرتووەتەوە .

2019/6/17 بە کوشتنی (مورسی) , (مصر) و (ئیخوانیەکان)ـیشیان لە جیهانی ئیسلامی دەرەوەی میسریش هێنایە ساحەی یارییەکەوە .

ئەم شەڕی داهاتووەی بە حساب (ئێران و ئەمریکا) و هەتا ساڵی نوێ ئامادە باشی دەکرێت بۆ ساحەی شەڕەکە .

شەڕەکە بە پلەی یەکەم ئاینیە , پاشان مەزهەبیە , پاشان قەومیە , پاشان ئابووریە , پاشان کۆمەڵایەتییە , وە پاشان ئەخلاقیە , پاشان.. هتد ...

واتا هەم,و لایەن و چەمکێك دەگرێتەوە . دێتە هەموو ماڵێك و کووچە و کۆڵان و گوند و شار و شارۆچکەیەکەوە .

هۆکاری سەرەکی ئەم شەڕە , نەبوونی سەرکردە و کۆمەڵێکی ئیسلامیە ئەم هەموو فرقە و ڕەوت و فکرە ئیسلامیانە کۆ بکاتەوە . ( فإن لم یکن لهم جماعة ولا إمام ؟.. )

ئەم ڕووداوانەش هەمووی مایەی خێر و بەرەکەتە بۆ دینی خودا و سەرخستنی ئاینەکەی .

چونکە دەبێت ئەم هەموو فیرقە و کۆمەڵە ئیسلامیانە لەناو بچن و نەمێنن . هیچیشیان لەناو ناچن بە لەناوچوون و دەمێننەوە .

کەواتا خێر و بەرەکەتەکەی چی بوو بۆ ( لا اله الا الله ) ؟..

ساڵی پار کتێبی (ئاخر زەمان لە دیدی قورئان)ـم نووسی ، پێوەری من 1250 ساڵی خێری دوکەڵاوی بوو .

لەگەڵ بەراوردکردنی لەگەڵ 100 ساڵی

( دُعَاة على أبواب جهنَّم مَن أجابَهُم إليها قذَفُوه فيها )

پاشان نیشانەکانی قیامەت , وەك گەڕانەوەی دوورگەی عەرەب بۆ مێرگ و گوزار .

لەگەڵ عەرەبی پێ پەتی بینای بەرز دروست دەکەن . ئایا لە بەرامبەردا باجەکەی چیە ؟..

بۆچی (دوبەی) یەکەم شارە و یەکەم شوێنی گەشتیاری و بازرگانیە لە جیهاندا و قەرەباڵغترین فرۆکەخانەیە ؟..

بەرز کردنەوەی پێ پەتی شوانی ڕووت و ڕەجاڵ لە پێناو چی دایە ؟..

وەك دەبینن لە پێناو لێدانی ئاینی ئیسلام دایە . کەواتا هەر کات بینیتان بینای بەرز لە لایەن پێ پەتیەکان دروست کرا .. دەبێت ئەوانیش لە بەرامبەر دا لە ئاینی خودا بدەن و دوژمنایەتی بکەن .

لە نێوان 1250 ساڵی خێری دوکەڵاوی و 100 ساڵ شەڕی بانگەشەکردنی بانگخوازی ئیسلامی ئال سعود و کەنداو بۆ دەرگاکانی جەهەنەم .

لێرەدا یەکێتی و یەکڕیزی و برایەتی موسوڵمان و (لا اله الا الله) و قورئان و سونەت نەما ..

کێ دەتوانێت ئەمانە زیندوو بکاتەوە ؟..

کێ دەتوانێت ئەو خاوەن دەسەلات و پارە و چەکانەی کەنداو لا بەرێت ؟..

لێرەدا دەبێت چاوەڕوانی نیشانەیەکی تری ئاخر زەمان بکەین , ئەویش (دەجال)ـە .

بەڵگەشم ئەوەیە کێشەی نێوان مرۆڤ و شەیتان لە سەرەتای دروست بوونیانەوە لەسەر ئەوەیە دینی خودا نەهێڵێت و خەڵکی شوێن (ئیبلیس) بکەون .

سەیری چیرۆکی پەیامبەران بکەن ، هەموو جار شەیتان شکستی هێناوە . لە ماوەی 1250 ساڵی خێری دوکەلاویش شەیتان بێ بازاڕ بوو .
لەم 100 ساڵە دا شەیتان باشترین بازاڕی هەیە بە سپۆنسەری خودی موسوڵمانەکان . تەنانەت لەگەڵ بڵاوبوونەوەی تۆڕی ئینتەرنێت و بەکارهێنانی لە لایەن هەموانەوە لە 2010 وە لەناو موسوڵمانان دا خوداش مرد .
نموونەیەکی بچوك باسدەکەم :
هەموو دەزانن 4 بۆ 5 ساڵە من وەڵامی دژە ئیسلام دەدەمەوە , لە بێدین و مەسیحی و جوو و زەردەشتی و قورئانی و .. هتد ...
لەم ماوەیەدا هێندە ڕەخنەم بینیوە ، پیت نیە لە قورئان ڕەخنەی لێ نەگیرا بێت . حەدیس و سەرچاوەکانی ترمان و مێژوو و.. هتد ...

بەهۆی بەدواداچوونم بۆ هەموو سەرچاوەکان . دینی ڕاستی زەمانی قورەیشم دۆزیوەتەوە ، چونکە پێوەری من بۆ وەڵام و دەم کوتکردنی بەرامبەر ئەسڵی ئاینەکە بووە کە دابەزیوە و خەڵك چۆن تێگەیشتوون ؟..
هەموو وەڵامێکم بردووەتەوە سەر ئەسڵی ئاینەکە . لەم نێوانە دا بۆم دەرکەوتووە ، ئەم ئاینە دەفرۆشرێت لە لایەن حیزب و ڕەوت و مامۆستا ئاینیەکان دا و هەر یەکەیان ئاینی ئیسلام شیکاری دەکەن بە گەز و پێوەری خۆیان و ڕایدەکێشن بە لای بەرژەوەندی خۆیان دا ..
( فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ )
( مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ )

کاتێك هەڵەی ئەم حیزب و ڕەوت و فیرقانەم بینیوە . بە هەمان شێوە ڕاستیەکانم دەرخستووە . وەك چۆن ڕاستیەکانم دەرخستووە لەگەڵ دژە ئیسلام .
لێرە دا شوێنکەوتەی ئەو فیرقانە هەر هەموو کۆبوونەتەوە و لێیان داوم . هەر هەمووتان ئەو فلیم و شەڕانەی سەردارتان بینیوە و دەزانن . (لە فەیسبووك) .
کابرای موسوڵمانی عەوام خوداکەی مامۆستا و لایەنەکەیەتی , نەك گەڕان بە دوای ئەسڵی دینەکەدا .
ئاین و دینداری لە مامۆستا و لایەنەکەی وەردەگرێت , نەك لە خودا . لێرەدا خودا بزر بوو و نەما .

ئەم نموونەیە بکەن بە پێوەر بۆ حیزب و دەوڵەتەکان ، خاوەنی میدیا و دەسەڵاتن , چۆنیان بوێت یاری بە دین دەکەن . خۆتان دەیانبینن چۆن خودا بزر بووە و نەماوە .

لە ماوی 5 ساڵ دا تا ئێستا , یەك دژە ئیسلام شەڕی لەگەڵ نەکردووم . بەڵکو لە سەدان کێشە و شەڕدا پشتگیریان کردووم و یارمەتیان داوم .
نموونەیەکی بچوك : ئەکاونتێکیان کردبووەوە بە ناوی (کاك ماکوان کەریم)ەوە . شتی نەشیاویان بڵاو دەکردەوە و وێنەی ئەویشیان دانا بوو . لە گروپ خەڵکم کۆکردەوە بۆ ئەوەی ئەکاونتەکە بسووتێنن . الحمدلله موسوڵمان لەو بوارەشدا فاشیلن . یان نەزانن یان دژایەتی (ماکوان) دەکەن لەسەر شتێکی سەخیف .

بێدینەکان نامەیان بۆ ناردم گوتیان :
کاك سەردار ,خۆت دەزانیت دوژمنی ئێمە (ماکوان)ـە . لەبەر خاتری تۆ ئەو ئەکاونتە دەسووتێنین , 15 دەقەمان بۆ دانێ .. لە 10 دەقە دا ئەکاونتەکەیان سووتاند .

شایەتی دەدەم لە ڕۆژی قیامەتیش دا , کە هیچ دژە ئیسلامێك شەڕی لەگەڵ نەکردووم .
هەر هەموو شەڕەکان موسوڵمان بوون . شەڕەکانیان لەسەر ئەوە بووە باسی خوداکەیانم کردووە و ڕەخنەم لە دینی خوداکەیان گرتووە .
هەمووتان شەڕەکانتان بینیوە و شایەت حاڵن کە دوژمنی من موسوڵمان بووە نەك دژە ئیسلام . لە کاتێك دا من دژە ئیسلامم کوتیوە بەهەموو باڵەکانیەوە .

بزر بوونی خودا و سەرهەڵدانی خودای نوێ بە ناوی ئاینی ئیسلامەوە ئێستا بەر بڵاوە و هەموان دەیبینن .
ئەمەش یەکێکە لە ئاواتەکانی شەیتان .
لە زەمانی ئادەمەوە هەوڵی بۆ دەدات . لەم 100 ساڵەی کۆتایی دا ئاواتەکەی هاتووەتە دی و ئامانجەکەی پێکاوە .
گەورەترین ئاین و کۆتا ئاین , ئاینی ئیسلامە . بێ ساحێبە , بێ سوپایە , بێ مامۆستایە .
بێ هەموو شتێکە و هەموو کەس دەتوانێت یاری پێبکات .

کەواتە باشترین بار و دۆخ بۆ دەرچوونی (دەجال) ڕەخساوە . هێنانی سوپای زۆر بۆ ناوچەکە بە ناوی شەڕی ئێرانەوە کۆتا بزمارە لە تابووتی ئاینی ئیسلام دەدرێت . کاتێك باسی حەدیسی (فیتنەی دەجال) دەکرێت .
تەمەنی (دەجال) (ساڵێك و چل و یەك) ڕۆژە کە حوکم دەکات و دەردەکەوێت .
فریا ناکەوێت بگاتە هەموو جیهان و هەموو خەڵك اعترافی پێبکەن . ئەو بار و دۆخەی ئێستا دەیبینین و تێی داین . ئامادەکاریە بۆ هاتنی (دەجال) .
ئێستا هەر یەك لە ئێوە با حەدیسەکانی دەجال و فیتنەی دەجال بخوێنێتەوە . هەر هەمووی لەم ماوەیەدا ڕوودەدات کە شەڕ و پێکدادانەکان زۆر دەبن .

شەڕەکانیش وەك گوتم : فرە لایەنە و تەنانەت بچووکترین بواری ژیانیش دەگرێتەوە . بۆ ئەوەی هەموو دنیا بزانن هێز و دەسەڵات لای (ئێران و ئەمریکا)یە .
دەبێت ئاینی ئیسلام و خودا و قورئان بچێتە هەزاران پلە ژێر سفرەوە لای هەموو جیهان . ئەو کات کە (دەجال) دەرکەوت , هەر هەموو کەس باوەڕ دەکەن خودایە .
شەش مانگیشی بەسە بۆ ئەوەی جیهان اعترافی پێبکات . نەك (ساڵ و چڵ و یەك ڕۆژ) . حەدیسەکانی فیتنەی دەجال لە 2019 وە جێ بەجێ کراوە .

بۆیە من لە 2019/1/1 وە گروپی (فەرمو بۆ خزمەتی نیشتیمان)م داخست . چونکە من دەبینم و دەزانم چی دەگوزەرێت لە داهاتوو دا . بەڵام مرۆڤ بە گشتی هەتا نەکەوێتە داوەکەوە هەست بە ڕووداوەکان ناکات .

ئێستا دەسەڵاتی ئیسلام سفره , خاوەنی هیچ ئیمامێك نین كۆمان بكاتەوه . قورسترین چەكی جیهانمان هەیە . بەڵام دەتوانین بۆ ماوەی مانگێك شەڕ بكەین . هەر كات فیشەك و سارۆخمان لێ بڕا .
هیچ كارگەیەكمان نیه ئازووخەی شەڕمان بۆ دروست بكات . بەرامبەرمان دەتوانن بە تیر و كەوان بمانگرن و بمانكەن بە كۆیله .

ئەم شەڕ و پێكدادانەی داهاتووش , فیتنەی دەجاله و ساحەكەی بۆ ئامادە دەكرێت , ئیتر چەند ساڵی تر دەردەچێت (الله اعلم) ..

پێوەرمان بۆ دەرچوونی ئەمانەیە :

**1** – ڕیسوا كردنی ئاینی سەلەفیزم و پەشیمان بوونەوەیان لە هەموو فەتوا و یاساكانیان , كە بەناوی خوداوه دەریان كردووه .
ئەم كارەش ئاسانه , بە چەكوشی (جمال قاشخچی) زوو زوو لێیان دەدەن و دەبێت ئەو هەموو شتانەی حەرامیان كردووه حەڵاڵی بكەنەوە بە ناوی تازەگەری و پێكەوە ژیان و لانانی توند و تیژی و كراوەیی .

ئەم كارەش سوودی دوو لایەنەی هەیە :

**یەكەم** : خەڵكانێكی زۆری نا موسوڵمان تانه لە ئیسلام دەدەن و بە سەركەوتنی خۆیانی دادەنێن بەوەی ئاینی ئیسلام درۆ و خورافات و پووچەڵه . بەڵگەكانیشیان بەهێزه .
هەر ئەو فەتوا حەرامانەی دین فرۆشەكانی دوێنێی سەلەفیزمە ئەمڕۆ حەڵاڵ كراوه .
زۆرینەی موسوڵمانی عەوامی ئیمان لاوازیش دەچێتە پاڵیان . چونكە ئەو جۆره كەسانه نازانن ئاینی ئیسلام چیە و دینیان لە دەمی خەڵك وەرگرتووه .
كاتێك دەبینین دوێنێ سایەقی بۆ ئافرەت حەرام بوو , ئەمڕۆ حەڵاڵە . دوێنێ گۆرانی حەرام بوو , ئەمڕۆ كۆنسێرت دەكرێت لە سعودیه . هەروەها هەموو دین و حەرامەكانی دوێنێ حەڵاڵ دەكرێت .،
بەو شێوەیە لایەنگر و شوێنكەوتەی (دەجال) لە موسوڵمانەكان زۆر زیاد دەكات .

**دووەم** : سەلەفیزم و دینی وەهابی لەناو دەچێت . بەو شێوەیە ئاینی ئیسلام پاك دەبێتەوە ، موسوڵمانە پاك و بۆ خودا سوڵحاوەكان دەمێننەوە . لەوەش گرنگتر ئەوەیە خەڵكە موسوڵمانەكە فۆڕمات دەبنەوە و ئاینە ڕاستەكە دەدۆزنەوە .

چونكە لۆرانسیەكان ئەو هێز و دەسەڵاتەی جارانیان نامێنێت , وەك پێگەی ئاینی و سەربازی و ماددی .
بەو شێوەیە لەوەڕ لە شوێنكەوتەكانیشیان دەبڕێت . وە هەر كات بێ لەوەڕ مانەوە دەسەڵاتی وەلی ئەمری ئەو ناوچەیە لەوەڕیان ناداتێ , چونكە دەجال و فكری دەجال , دەبێت بە جێگرەوەیان .
سەلەفیش واتا جاسووسی و ناشرین كردنی هەر كەسێك سەلەفی نەبێت و تهجیر و تبدیع و تفسیق و تكفیر ... كردنیان . بۆیە ئەمانە لە هەردووك جەژنەكە دەبن .

**2 – ناشرین کردنی ئاینی ئیسلام و دەقەکانی ، ئەویش لە ڕێگای ئەو گروپە جیهادیانەی دروست دەبن لە هەموو ولاتە بەناو ئیسلامیەکانەوە . دەبێت بڵێین : ڕەحمەت لە داعش !..**

**دەبێت داهاتوو چۆن بێت (حمیدتی) لە (سودان) کراوە بە سەرۆك , شوانی حوشتر بووە لە (دارفۆر) بەرز کراوەتەوە بۆ پلەی (فریق اول رکن) !..**

**واتا دووەم کەس بووە دوای (بشیر) کە سەرۆکە . هیچ قوتابخانەیەکی سەربازی نەخوێندووە . خۆتان تصور بکەن چۆن پیش وەخت کەسەکان ئامادە کراون ؟!..**

**2019/10 لە (جەزائیر و تونس) ئینتخاباتە و چاوەڕوانی مفاجئات بن ..**

**3 – ناشرین کردنی دین و یاری کردن بە ئیمانی ئەقڵی عەوامی موسوڵمان لە ڕێگای میدیاکان و ئینتەرنێتەوە .**

**4 – برسی کردنی میللەتان و دەبێت چاومان لەسەر دەسەڵات بێت و ملکەچی بین قووتی ڕۆژانەمان بداتێ .**

**5 – زەلیل کردنی تاك لە هەموو جێگایەك . کەی بە تەواوەتی زەلیل بووین , ئەو کات (دەجال) دەردەچێت و ساحەکەی بۆ خۆش کراوە .**

**ئەو حەدیسانەی باسی (فیتنەی دەجال) دەکەن لەو پێنج خاڵەی سەرەوە دایە . کەواتا قەپ گرتن بە دارەکە دا لەو زەمانەی پێش هاتنی دەجالە . هەر کەس بتوانێت خۆ ڕاگر بێت . ترسی لە (دەجال) و دەرکەوتنی نەبێت .**

**بەڵگەشم :**

**لە (کتێبی ئاخر زەمان لە دیدی قورئان)دا , باسم کردووە (دەجال) خودی (شەیتان)ـە . بۆیە لێرە باسی دەرچوونی دەکەم .**

**شەیتان , دوو جار داوای لە خودا کردووە دوای بخات و ڕۆحی نەکێشێت .**

**جاری یەکەم : ( قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ )**

**لێرە دا داوا دەکات وازی لێ بهێنێت هەتا ئەو ڕۆژەی خەڵك زیندوو دەکرێتەوە . خودای زانا وەڵامی داوەتەوە : ( قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ )**

**ئەو ڕۆژەی دیاریکراوە بمێنێتەوە و بکوژرێت , ئەو ڕۆژەیە کە مەسیح (علیه السلام) دەیکوژێت .**

**کەواتا ئەو (ساڵ و چل و یەك) ڕۆژەی (دەجال) دەردەکەوێت , کۆتا ڕۆژی ( يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ )ـەیە , کە خودا دەیفەرمووێت .**

**بەڵگەشم :**

**جاری دووەمە : کە داوای مانەوەی دەکات :( لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلاَّ قَلِيلاً )**

**لێرەش هەمان شتی داوا لێ دەکات , بەڵام ئەم جارەیان دوای بخات هەتا ڕۆژی قیامەت . لەگەڵ ئەوەشدا هەڕەشە دەکات لە مرۆڤ و دەڵێت : ( لاحتنكن ذريته الا قليلا ) .**

(حنك) واتە : بەینی دەم ، عەرەب ئەو وشەیە بەکار دەهێنێت بۆ لەناوبردن و نەمانی شتێك .
کاتێك (کولله) بەسەر شوێنێك دا دەدات و زۆربەی هەرە زۆری بەر و بوومەکە دەخوات , دەڵێن : ( **احتنك الجراد الأرض** ) .. وە کاتێك ئەسپ لغاو دەکرێت , دەڵێن : ( **حَنَكْتُ الفرسَ** ) .

لێرە دا هەڕەشەکەی ئەوەیە :
کە زۆرینەیان لە خشتە دەبات و لغاویان دەکات .
وشەی (حنك) زۆر گرنگە , ئەگەر لەگەڵ بڵاوبوونەوەی کولله بەسەر زرعات دا شیکاری بکەین .
چونکە کولله سەوز و وشك پێکەوە دەخوات وێرانی دەهێنێت بۆ ئەو ناوچەیە . دەبێتە هۆی قات و قڕی و نەبوونی و هەژاری و برسیەتی .

پاشان ئەگەر سەیری مێژووی کۆن و شوێنی ئاوەدانی و ژمارەی سەرنشینی جیهان بکەین .
زەمانی ئێمە زۆرترین سەرنشین و ئاوەدانی تێدایە , شەیتان پێشتر خەڵکی لە خشتە بردووە بەڵام ژمارەیان قەت هێندەی ئێستا زۆر نەبووە .
لەم ماوەیەی داهاتوو دا هەتا دەرکەوتنی (دەجال) , دیقەت بدەین بزانین یاریمان پێ دەکرێت بە ڕسق و ڕۆزیمان و ئەم دەسەڵاتانە وەك کولله هەموو سامانمان دەبەن بۆ ئەوەی موحتاجیان ببین !..

ئەگەر ئەوە ڕووی دا :
ئەو کات دڵنیا دەبین ئەم یاریانە بۆ ئامادەکاری (دەجال)ـە و تەفسیری من بۆ ئەو ئایەتە دروستە (ان شاء الله) ..

خاڵێکی تری گرنگ هەیە :
شەیتان گوێ ناداتێ ئەوەی دوای دەکەوێت دیندارە یان بێدینە ؟.. ئەو کار لەسەر ئەوە دەکات زۆرترین مرۆڤ دوای بکەوێت . کاریش لەسەر ئەوە دەکات ئاینی خودا فەشەل بهێنێت . لە ئێستاشدا تاکە ئاین کە هی خودا بێت ئاینی ئیسلامە . بۆیە یاری شەڕەکان هاتووەتە دەوڵەتە بەناو ئیسلامیەکانەوە . هەرچەند ئەم ئاینە لاواز بێت و بێهێز بێت بەڵگەیە بۆ دەسەڵاتی (دەجال) , وە غەیرە موسوڵمان بەگرێتی شوێنی دەکەون .

ئاینی ئیسلام , ئێستا خۆی نەك لاوازە بەڵکو لە داڕماندایە ، بە تێپەڕبونی کات لەم چەند ساڵەی داهاتوو دا بەرەو مردن و نەمان دەچێت و هەڕەشەکەی شەیتان لە قۆناغی جێبەجێ کردن دا دەبێت .

**100** ساڵ واتە قەرنێك ، قەرنێکە ئاین گۆڕدراوە بەهۆی سەلەفیزمەوە . شەیتانیش سەدان قەرنە خەریکی گومڕاییە (سەردار)یش دەیەوێت خەڵکی لەو گومڕاییە ئاگادار بکاتەوە . خەڵکی بە گشتی شوێن ئاین و خودای ئەو قەرنە دەکەون ..
کەواتە دەبێت بە کورتی و بە کوردی کۆتایی بهێنین بەم باسە . چونکە ئامادەکاری دەکرێت بۆ دەرچوونی سەدان قەرنی شەیتان (بها يطلع قرن الشيطان)
مەنهەجی منیش فێرکاریە ، خەڵکیش تاقەتی خوێندنەوەیان نیە . خوداکان زۆر بوون بە ناوی (لا اله الا الله)وە .

هەموو شامانێك خودایە و جێگری شەیتانە و خەڵكیش لە دوایەوە نوێژ دەكات , خوداش باسی مرۆڤمان بۆ دەكات دەبێت وریا بێت و بە بچووكترین ئاماژە خۆی بدۆزێتەوە ( وَعَلَامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ) , خەڵكی ئەم زەمانەش خوێندەوارن ، هەمووشیان نە خوێندەوارن . ملیۆنەها (علامات)ـیان بۆ باس بكەت (لا یهتدون) .

پاش ئەوەی (شەیتان) گوتی : زۆرترین كەس گومڕا دەكەم . خودای زانا فەرمووی : ( قَالَ اذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ ) .
(اذهب) لە قورئاندا , وەك فەرمان لە لایەن خوداوە (حەوت) جار هاتووە . دانەیەكیان بۆ شەیتانە .
(شەش) دانەكەی تر بۆ مووسا و هارونە (علیهما السلام) . (اذهب) واتە : بڕۆ ، مووسا و هارون (علیهما السلام) , ڕێگای هیدایەت بوون , نێردراون بۆ لای (فیرعەون) كە گوتوویەتی : من خودام .

شەیتانیش (ان شاء الله) لەم چەند ساڵە دا دەردەكەوێت , دەڵێت : من خودام . هۆكاری دەركەوتنی (دەجال)یش هەمان شتە ( قَالَ اذْهَبْ ) , خودا دەفەرمووێت : بڕۆ بۆ لای ئەوانەی مامۆستا و ڕەوت و حیزب و لایەنەكانیان كردووە بە خودا , ( فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ ) , بۆیە پێوەرەكانی ئاخر زەمان پێچەوانە دەبێتەوە .
من و تۆی موسوڵمان خودامان بزر كردووە و ناشگەڕێین بزانین (الله) و منهجەكەی بدۆزینەوە .
كەواتا زۆرینەمان لەوانە دەبین ( فمن تبعك منهم )

سەیری ئەو پاداشتە بكە بۆمان دانراوە ( فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَاؤُكُمْ جَزَاء مَّوْفُورًا ) , پاداشتمان بە زۆری و بەر بلاوی هەیە لە جەهەنەم دا , چونكە خودامان بزر كردووە . شوێن (دەجال) بكەوین و شوێن ئەم مامۆستا و لایەن و ڕەوتانە بكەوین هەمان شتە . لە هەردوك لا (الله) بزرە.
ئەو ئایەتانەی سەرەوە بۆ زۆر پێش ئێمەشە , چونكە شەیتان زۆر لە مێژە خەڵكی گومڕا دەكات . بەڵام قەت سەر زەوی هێندەی ئێستا مرۆڤی تێدا نەبووە . هیچ زەمانێكیش هیچ ئاینێكی خودا وەك ئێستا بەربلاو نەبووە و بۆ ماوەی 1400 ساڵ حوكم بكات .
دەرچوونی (دەجال) كۆتا كێشمە كێشی نێوان (الله) و (ئیبلیس)ـە لەسەر زەوی . (الله) دەزانێت (ئیبلیس) چییە و (ئیبلیس)ـیش دەزانێت (الله) كێیە . ئەوەی نازانێت (ئیبلیس) و (الله) كێنە , ئێمەی مرۆڤین بە تایبەتی موسوڵمان كە دەڵێین : ( لا اله الا الله ) .

دەرچوونی (دەجال) بە شێوازی نوێیە ، چونكە كاتێك هەڕەشەی كرد , خودای زانا فەرمووی :
( وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ ) .
لێرە دا وشەی (صوت) و (خیل) هاتووە .
شەیتان زۆرترین كەس استفزاز دەكات بە دەنگی ، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا (صوت) بە گۆرانی هاتوە . تەفسیرەكە 100٪ تەواوە و پێكاویەتی .
كاتێك كۆنەكان (صوت) بە گۆرانی تەفسیر دەكەن , مەبەستیان ئەم گۆرانیە نیە كە ئاینی سەلەفیزمی وەهابی باسی دەكەن .. مەبەست ئەو گۆرانیانەیە كە شیعەكان و سۆفیەكان و كڵێسا و جوو و هەموو ئاینە ئاسمانی و مرۆییەكان لەسەر مینبەر یان لە كۆڕەكانیان دا بەكاری دەهێنن .

به گۆرانیەوە وەسفی خودا و مەنهەج و کەراماتی شێخەکانیان دەکەن . لە کتێبی ( هەباسە لە دیوەخان چ باسە ؟.. ) بە تەفسیلی باسم کردووە .

شەیتانیش خاوەنی ئەزموونی سەدان قەرنە لە فێر کردنی گۆرانی و ستایش بە بتەکانیاندا . بەڵام ئەوەی من لەم ئایەتە تێی گەیشتووم بە گوێرەی دەرکەوتنی (دەجال) و (دەجال) (ئیبلیس)ـە ئەمەیە :

(صوت) سێ جار لە قورئان دا هاتووە . یەکێکیان بۆ شەیتانە ، دوانەکەی تر :

( وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ )

( لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ )

وەك دەبینن (صوت) هەر صەوتە و مانا و تەئویلاتی جیای نییە وەك لە قورئان دا ئاماژەی پێ کراوە .

لێرەدا دەپرسم : کێ گوێی لە دەنگی شەیتان بووە ؟..

وەڵام : (شێخانی سۆفیزم) و (عەمامە بەسەرە شیعەکان) و (قدیسە گاور و جووەکان) و پیاوە ئاینیە گەورەکانی ئاینەکانی تری ئاسمانی و مرۆیی ...

هەر هەموویان مامەڵە لەگەڵ (شەیتان) دەکەن ، هەر کەس شارەزا بێت لە ئاینی سۆفیزم و شیعە ئەو شتانە دەزانێت تەنانەت لە لای گاورەکان خەڵکی ئاسایی ئیماندار , ڕۆحی پیرۆز دەبینێت و دێتە لاشەیەوە ..

لە یوتوب بنووسن : ( holy spirit ) . ڤیدیۆی زۆرتان بۆ دەهێنێت . ئەم دیاردەیە لای هەموو ئاینە (منحرف)ـەکان هەیە و لای خۆشمان لە (شیعە و سۆفی)دا هەیە .

کرۆکی باسەکە ئەمەیە:

ئایا شێخان و پیاوە ئاینیە گەورەکان , شەیتان خۆی دەبینن و فەرمان لەوان وەردەگرن و گوێیان لە دەنگی دەبێ ؟..

وەڵام : نەخێر .

ئەوانە بە گوێرەی ئەو ویردانە و توانایان (جن) دەبینن , پاشان (عفریت) , هیچیان ناگەنە ئەو پلەیە (شەیتان) ببینن یان گوێیان لە دەنگی بێت .

کەواتە ئەو (صوت )ـەی ( وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ ) , دوو مانا دەبەخشێت . مانای یەکەمی ئەم ئامادە باشیەیە کە بۆ هاتنی دەکرێت لە میدیاکان و ناو خەڵکیەوە . بە هەموو شێوەیەك دەنگەکان بەرزە بۆ ناشرین کردنی ئاینی ئیسلام و قورئان .

شەیتانیش هەزاران ساڵە بۆ ئەوە هەوڵ دەدات . تا ئێستا ڕوو بە ڕووی ئاینێکی ئاسمانی نەبووەتەوە 1400 ساڵ بەردەوام بێت و بەهێز بێت . ئێستا مرۆڤ 99٪ ـی کارەکانی بۆ دەکات و ئەو دێتە سەر حازری .

وە 1٪ ـەکەش دەنگی خۆیەتی کاتێك دەردەکەوێت ، لەوانەیە خۆشترین و سەرسامترین دەنگی هەبێت و خەڵکێکی زۆر بە ئاوازەکانی دەنگی ڕابکێشێت بۆ لای خۆی .

پاشان ئەو شارەزای هەموو گۆرانی و دەنگەکانە پێشتر بۆ بت و خوداوەندەکان گوتراوە . دەزانێت کامیان زۆرترین خەڵك بەلای خۆی دا ڕادەکێشێت .

هەر کەسێك متابەعەی ئەفسانە کۆنەکان و باسی دەنگی خودای کرد بێت . دەزانێت دەنگی خودا چۆن وەسف کراوە ؟.. هەر لە وەسفەکەی خەڵکی حەزیان لەو دەنگەیە . تەنانەت شیعەکان لە ئێستا دا لە کەناڵەکانیانەوە دەنگی خودایان هەیە و دەتوانن بگەڕێن لە یوتوب ببیینن .

ئەم ئایەتە : ( وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ )
بەڵگەیە بۆ ئەوەی (دەجال) شەیتانە و بە دەنگ و ڕەنگ دەردەکەوێت . ڕەنگەشی باس کراوە ، پاش دەنگەکە خودای زانا دەفەرمووێت : ( وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ ) ..

( و اجلب عليهم ) واتە بۆیان بهێنە ، مفسرین دەڵێن : واتا بە دەنگت . مەبەست لەوەیە کاتێك خەڵکی کۆدەکرێتەوە دەنگی زۆریان لێ دەردەچێت . ئەو دەنگەش ئێستا ئێمە لە سەرەتای داین و لە داهاتوو دا زیاتر و زیاتر دەبێت .
کاتێك خۆشی دەردەچێت ئەو کات دەبێت بە ڕاستی .
خەڵکەکە باوەڕ دەکەن و شوێنی دەکەون , چونکە لە ئێستاوە ئامادەکاری بۆ دەکرێت بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە بهێنرێتە ساحەکە و شوێنی بکەون . ئەو خەڵك هێنانەش بە : ( بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ ) .
(خيلك) لە (خيل) هاتووە ، (خيل) واتە : جولان بە جۆری جیاواز و ڕەنگدانەوە . بۆیە بە خەیاڵ و داڵغە دەڵێین (خەیاڵ) لە ئەسڵی عەرەبی وەرمان گرتووە (خيال) .

خەیاڵەکانمان جۆرا و جۆر و ڕەنگا و ڕەنگن ، مرۆڤ نیە خەیاڵ لێنەدات . ئەم خەیاڵانە هەرهەمووی وەسوەسەی شەیتانە بۆ ئەوەی لە واقع دوور بین .
عەرەب بە ئەسپ دەڵێت : (خيل) , چونکە ئەسپ لە مەیدانی شەڕ دا باشترین دەوری هەیە . کوردی خۆشمان دەڵێت : ئەسپ بە سوارەکەیەتی .
مەبەستی ئەوەیە ئەسپەکە گرنگ نییە , سوارەکەی سەری گرنگە چەند ئازایە و بە توانایە . لە مەیدانی شەڕ دا ئەو سوارە هێندە کاری ئازایەتی و چاونەترسی دەکات . بە خەیاڵی کەس دا نەهاتووە .
بۆیە (خيل) , بۆ خەیاڵ و ئەسپ بەکاردێت . کوردیش کاتێك لەگەڵ یەکێك دەکەوێتە کێشمەکێش و منافەسە دەڵێت : ئادەی ئەسپی خۆت تاودە ، یان ئەسپی خۆمم تاودا یان.. هتد ...

بۆیە تەفسیرێکی تری ئەم ئایەتە ( وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ ) بە گوێرەی ئێمە لە واقعەکە دا دەژین .
(ئیبلیس) کۆتا ئەسپی تاو دەدات ، ئەوەی ئەو دەیزانێت و دەیکات بە خەیاڵی هیچ کەس دا نەهاتووە و نایەت .
بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت : هەموو پەیامبەران خەڵکیان ئاگادار کردووەتەوە لە فیتنەی (دەجال) .
ئەوە ئێستا سەرەتای یاریەکانە ، خەڵکی کونە مشکیان لێ بووە بە قەیسەری و سەریان لێ شێواوە .

بە دڵنیاییەوە لە سەرەتای ساڵی 2020 ـەوە ، شەڕی جەبهەیی دەست پێ دەکات بە چەك .
بێجگە لە شەڕی میدیا و نەفسی و جۆرەها شەڕی تر کە بە خەیاڵمان دا نەهاتووە دەکەوێتە هەموو ماڵێکەوە .
ئەی ئەگەر جەنابی (دەجال) خۆی دەرکەوێت بە دەنگ و ڕەنگەوە ؟.. خاوەنی هەمو فێڵێکە ،
دەبێت تواناکانی (ئیبلیس) چۆن بێت کە شارەزای هەمو لایەنێکی ژیان و مرۆڤە لە سەرەتای خەلقیەوە ؟..

بەڵێ بەڕێزان (دەجال) ئیلا دەبێت (ئیبلیس) بێت . چونکە ئەگەر مرۆڤ بێت خودا بەرپرسیار دەبێت کەسێك بنێرێت لە ئاخر زەمان دا ئەو هەموو توانایەی بداتێ و پاشان ئەگەر محاسەبەی بکات .

کابرای داماو هیچ تاوانی نییە و خودا ئەو توانایەی داوەتێ , لەسەر چی بنەمایەك محاسەبەی دەکات ؟..

گەر محاسەبەشی نەکات ئەو خەڵکە دەڵێن : تاوانمان چییە دوای (دەجال) کەوتووین ؟..

خودایە خۆت دەسەڵاتت داوەتێ . ئەگەر وەك ئێمە بووایە بێ دەسەلات بووایە کەس دوای نەدەکەوت ..

ئەمەیە ڕاستی ئاخر زەمان . واتا کۆتایی زەمان ، کۆتا گرەو و کێشمەکێشی نێوان مرۆڤ و شەیتانە .

هۆکارەکەشی ڕوونە . 100 ساڵە سەلەفیزمی وەهابی دین دەگۆڕن , لای خەڵکی بووە بە ئاینی ڕاستی .

سەریان لێ تێك چووە و نازانن کێ ڕاست دەکات و کێ بۆ خودایەتی تا شوێنی بکەون ؟..

موسوڵمانە عەوامەکە بە سەلەفی و نا سەلەفیەوە لە (ئال سعود) و زاناکانی تاوانبارترن . هیچیان تاقەت و توانای گەرانیان نیە بە دوای ئەسڵی دینەکەیان دا .

ڕازین بە هەموو شتێك بەس نانی ڕۆژانەیان هەبێت . هەموو بار و دۆخەکانی ئەم 100 ساڵەی کۆتایی لەم ئایەتە دا کۆ بووەتەوە :

( الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ وَاللَّـهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا وَاللَّـهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ) ﴿البقرة: 268﴾

هەر موسوڵمانێك دەبینیت لە جیهاندا , لە ترسی فەقیری و نان بڕانی شوێن هەموو یاسایەك دەکەوێت و یاسای الله بەرەو نەمان چووە .

بۆیە خودای خاوەن دەسەڵات بە (دەجال) و دەست و پێوەندەکانی . ئەم گەندەڵانە هەرهەمووی لەناو دەبات .

لێرەدا موسوڵمانی ئاقڵ ئەو کەسەیە دینەکەی و (الله) بدۆزێتەوە .

هاتنی (دەجال) و ئەم بار و دۆخانە , گەورەترین سەرکەوتنە بۆ ئاینی خودا . چونکە هەر هەموو موسوڵمانەکان بە مامۆستا و زانا و عەوامەوە لە بێژنگ دەدرێن .

لێرەدا جێگای خۆیەتی وتەیەکی (صدیق الاسلام) بکەین بە نموونە ، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) مرد .

فەرمووی : ( هەر کەس محمد دەپەرستێت , محمد مرد .. هەر کەس خودا دەپەرستێت خودا ماوە و نامرێت ) .

تاوانە ئەم بانگخواز و زانا دین فرۆشانەی ئێستا بهێندرێنە ڕیزەی خۆشەویستەوە (ﷺ) .

بۆیە من دەڵێم : ئەم ماوەیە هەتا دەرکەوتنی (مەهدی) ، هەر کەس ئاین و مەنهەجی محمدی (ﷺ) تێکداوە و خوداکانیان لایەن و مامۆستا و حیزبەکانیانە , هەموویان دەمرن و دەبن بە سووتەمەنی (دەجال) .

هەر کەس (الله) بناسێت و بۆ (الله) هەوڵ بدات , نامرن و دەمێننەوە و دەبن بە نوێکەرەوەی ئاینی ئیسلام لەگەڵ (مەهدی) دا ..

ئێمە دەبینین هێزێکی زۆر هەیە عەلمانی و گاور و شیعەن و شەڕێکی گەورە ڕوو لە ناوچەکە دەکات .
موسوڵمان هیچ ئیمام و دەسەڵاتێکیان نییە .
بە هەموو پێوەرێك هێزی بەرامبەر سەردەکەوێت ، ئێمەی موسوڵمان شکست دەهێنین . لەگەڵ هاتنی (دەجال) زیاتر شکست دەهێنین . لێرەدا پێویستمان بە دەسەڵاتی (الله) هەیە . بۆ سەرخستنی دینەکەی نەك سەرخستنی ئێمەی موسوڵمانی نەزان .

ئێستا ئەو زەمانەیە قەپ بە دارێك دا بکەین هەتا (مەهدی) دەردەکەوێت .
ئەم قسەیە واتا فەشەل , واتا بێ غیرەتی , واتا بێدینی , واتا بێ دەسەڵاتی , واتا دەرچوون لە هەمو بنەمایەکی مرۆیی و ئاینی پێکەوە .
ئەوەی ئەم بار و دۆخەی دروست کردووە (الله) نییە ، (شەیتان) و (دەجال) نییە ، دەسەڵاتی زلهێزەکان نییە ، دەسەڵاتی دەوڵەتە بەناو ئیسلامیەکان نییە ...
بەڵکو نەزانی و شکستی ئێمەی موسوڵمانە , نەمان توانیوە لە دوای دەوڵەتی عوسمانیەوە دەسەڵاتێکی ئیسلامی دروست بکەین و سنوورەکانی (سایکس بیکۆ) بشکێنین و یەك دەوڵەت و یەك ئیمامان هەبێت .

بۆیە کاتێك (مەهدی) دێت ، کاری بە ئێمە نیە و بە پشتی ئێمە نایەت , هەتا پشتگیری بکەین یان شەڕی بۆ بکەین چونکە توانای شەڕی هێزی بەرامبەرمان نییە وەك چەك و ئامادەکاری .
(مەهدی) کە دێت خودای خاوەن دەسەڵات بە فریشتە و موعجیزە سەری دەخات . وەك چۆن (سلیمان)ـی بە موعجیزە و بە جن سەرخست . هەرکەس دوای ئەو حەدیسە درۆیانەی هاتنی (مەهدی) کەوتووە لە خەیاڵدا دەژی .
چونکە ئەو حەدیسانە هەمووی زەعیف و بێ سەر و بەرەن ، تەنانەت لە زەمانی 1250 ساڵی دوکەلاویی پێش (لۆرانسی)ش , زانایانی موسوڵمان گرنگیان پێ نەداوە .

بۆیە لە ئێستا بەرەو دواوە چاوەڕوانی ئەم سیناریۆیانە بن :
(اليماني) دەردەچێت ، واتە : یەمەنیەکە .
ئەم (یەمانی)ـە تایەفەیەکی (شیعە) پەیدا بوون باوەڕیان پێیەتی . موسوڵمانی سونەش باوەڕیان پێیەتی .
ناوی (حسن التهامي)یە , ئێستا لە ژیان دایە . من وەك (شاسوار عبدالواحد) دەیبینم ، شاسوار کەسێکی نەناسراوە و هیچی نیە , شاخێکی داگیر کردووە , سێ شاری دروست کردووە , یاری و میدیا و نیشتەجێ بوون .
کەس نازانێت (شاسوار) کێیە و چۆن ئەو دەسەلاتەی پەیدا کرد . ئەم (یەمانی)ـەش بە هەمان شێوەیە , تەنانەت کوردی خۆشمان باوەڕی پێیەتی .

(سفياني) لە سوریاوە دەردەچێت ، ئەمەش بە حسابی (شیعە) دەجالە و (یەزیدی کوڕی معاویەی بن سفیان)ـە .

بێجگە لەو دوو سیناریۆیە , چاوەڕوانی سەدان سیناریۆی تر بکەن بە شێوەی هۆلیودی دەردەچێت .
وەك :

پەیدابوونی (ئاڵا ڕەشەکان) ، دڵنیا بن بە ڤیدیۆ و بە سیناریۆ , لە ئاسیای ناوەڕاستەوە خەڵکت بۆ دەهێنن بە ئێرانیدا تێدەپەڕێت و دێن بەرەو عێراق و شام . بۆ ئەوەی زۆرترین موسوڵمان بێنە ناو شەڕەکەوە .
هەرچی حەدیسی لاوازی (نعیم بن حماد) هەیە , بە سیناریۆی هۆلیودی بۆت دەهێننە بەر دەستت .
ئاقڵ ئەو کەسەیە شوێنیان نەکەوێت .

باسی (شەڕی هەرمجدۆن)ـیشت بۆ زیندوو دەکەنەوە و مەسیحی زۆریش لە هەموو جیهانەوە دەهێنن بۆ ناوچەکە , بۆ پێشبینیەکانی (یوحنا اللاهوتی) . بۆ ئەمەش هەمان شێوەی (نعیم بن حماد) سیناریۆی هۆلیودیت بۆ دروست دەکەن . سەردانی (پاپای فاتیکان)یش بۆ عێراق , ئامادەکاریە بۆ هەمان مەبەست .
ئاقڵ ئەو کەسەیە باوەڕ بەوەش نەکات ، سیناریۆی جەنگی جیهانی سێیەم و شەڕی ناوکیش زۆر باس دەکرێت .
ئەمەش وەك سیناریۆکانی تر درۆیە و ئەسڵ و ئەساسی نیە .
چونکە کۆتایی دنیا بە شەڕی ناوکی و (ملحمة الكبرى)ـی نعیم و هرمجدۆن نییە . بەڵکو هاتنی (مەهدی) لەگەڵ هاتنی (دەجال)ـە ، ئیتر لە ماوەی چەندەمی ئەو (ساڵ و چل و یەك) ڕۆژە دا دەردەکەوێت .. ( الله اعلم ) ...

هاتنی (مەهدی) بۆ ئەوەیە ئەم دەسەڵاتە ئیسلامیانە نەهێڵێت پاش ڕسوا بوونیان و لاواز کردنیان و کوتانیان لەلایەن ئێران و ئەمریکا و دەجالەوە .

هەروەها ئەو موسوڵمانە عەوامانەی کە ماون . یان ئەو هێزە چەکدارانەی ماون و هەڵخەڵەتێنراون , ئەو کات دڵنیا دەبن یاریان پێکراوە , یان شوێن (مەهدی) دەکەون , یان دژی دەوەستن . خودای خاوەن دەسەڵات خۆی دەزانێت چۆن ئەوانەش حەل دەکات .
مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) کە دێن سنوورەکان ناهێڵن و خیلافەی ئیسلامی دروست دەکات . ئاینی خودا زیندوو دەکاتەوە پاش ئەوەی 100 ساڵە یاری پێ دەکرێت بە دەست سۆفی و سەلەفی و شیعە و معتزلە و حیزبی و ڕەوت و.. هتد ...

مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) کە دێن . ئافرەتی موسوڵمان ڕزگار دەکەن لە کۆیلایەتی ئال سعود و فەتوا سەقەت و خێڵەکیەکانیان , کە دوورە لە بنەماکانی ئاینی ئیسلامی مەزنەوە .
بەو شێوەیە هەموو جیهان دەزانێت ئاینی ئیسلام گەورەترین ڕێزی لە ئافرەت گرتووە ، لە کاتێکدا ئەوان بۆ ماوەی 100 ساڵە لە ڕێگای ئافرەتەوە تانە لە ئاینی ئیسلام دەدەن .

مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) دێن دەست دەگرن بەسەر سێ چارەکی نەوتی جیهان دا , لە کەنداو عێراق و ئێران هەیە . ئەو داهاتە بە عەدالەتی دابەش دەکەن بەسەر موسوڵمانان دا , لە مەغریب هەتا ئەندەنوسیا .

دەست دەگرن بەسەر نیوەی هێزی ئەمریکا دا کە ئێستا لە ناوچەکەدان و لە داهاتوو دا زیاتر دەکەن .
ئەمریکا هەر ناوێرێ بێتە پێشەوە ، بە سیلاحەکانی خۆی لێی دەدەنەوە ، بۆیە بێدەنگ دەبێت .

دێن سەنتەرت بۆ دەکەنەوە لە هەموو بوارەکانی ژیان دا . گەنجی موسوڵمان لە دەوڵەتی ئیسلامی هیچی کەمتر نیە لە گەنجانی ڕۆژئاوا . بەلام (ئال سلول) و حاکمەکانی تر ناهێڵن داهێنان بکەن .
ئەمان دێن هەموو جۆرە هەلەکانت بۆ دەرەخسێنن . موسوڵمان و دەوڵەتی ئیسلامیش لەهەموو بوارەکان داهێنانیان دەبێت و منافەسەی دنیا دەکەن .
ئەمان دێن ئاینی خودا جارێکی تر زیندوو دەکەنەوە بۆ ئەوەی بۆ کۆتا جار بیسەلمێنن بۆ هەموو جیهان ئاینی ئیسلام ئاینی تیرۆر و گەمژە و نەزان و دواکەوتوو نییە , دەبێت هەموو دنیا ئەو راستییە بزانێت .

100 ساڵە یاریمان پێدەکەن (دنیا بەهەشتی کافرانە و دۆزەخی ئیماندارانە) . ئەمە قسەیەکی هیچ و بێ بنەمایە ، ئێمەی موسوڵمان بۆ نەتوانین دنیامان بەهەشت بێت و هەموو پێداویستی ژیانمان دابین بکەین وەك گەلان بژین لەژێر سایەی حوکمی (لا اله الا الله) .
چیمان کەمترە لە خەڵکی ڕۆژئاوا و یابان ؟.. ئەوەی ناهێڵێت دنیامان بکەین بە بەهەشت داهاتە بە دەست زاڵمانەوەیە , وە بەو حەدیسە یاریمان پێدەکەن بۆ دەسەڵاتدار دنیا بەهەشتە بەلاّم بۆ من و تۆی عەوام دۆزەخە .

بەڵێ بەڕێزان خودای خاوەن دەسەلاّت مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) دەنێرێت . ئاینی ئیسلام زیندوو دەکەنەوە وە دەیگەیەنن بە هەموو جیهان ، بە شێوازی سەردەم . ئەو ئیسلامە لە گۆڕ دەنێن کە (ئال سعود) دایمەزراندووە . بۆ خۆیان دنیا بەهەشتە و بۆ خەڵکی دۆزەخە . ئەمان دێن ئاینی خودا دەسەلمێنن نابێتە هۆکاری جەنگ و تیرۆر و زوڵم لە ئافرەت و دواکەوتوویی و بێدەسەلاّتی , کە چاومان لە دەرەوە بێت بۆ هەموو پێداویستیەکانمان .
چونکە ئەمان لە کاتێك دا دێن , ئاینی خودا سفرە , ئیمانی موسوڵمان لە ژێر سفرەوەیە . ئەگەر بێن و (ملحمة الكبرى) بکەن و ئاخر زەمان بێت . ڕۆژی قیامەت لایەنی سەرکەوتوو (ئێران و ئەمریکا)یە .
کەواتا خودای زانا چۆن و بەچی حوکمێك لێ پرسینەوەیان لەگەڵدا بکات ؟.. ئەوان سەرکەوتوون ..

ئەوان دێن بۆ ئەوەی : ( يُرِيدُونَ أَن يُطْفِئُوا نُورَ اللَّـهِ بِأَفْوَاهِهِمْ ) ,
بەلام خودای خاوەن دەسەلاّت : ( وَيَأْبَى اللَّـهُ إِلَّا أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ) .
بۆیە مەسیح و مەهدی (علیهما السلام) دەنێرێت :
( هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ ) .

دەبێت ئاینی خودا سەرکەوێت لە هەموو بوارەکان دا . خەڵکی موسوڵمان و نا موسوڵمان ببینن . دەبێت ڕۆژئاوا هەوڵ بدەن بێن بۆ دەوڵەتی ئیسلامی بۆ ئەوەی فرسەتی کاریان دەستکەوێت و دراسات بکەن .
خودای زانا بەم شێوەیە ئاین و دەسەلاّتی خۆی نیشانی هەموو جیهان دەدات . ئەوانەی لەو زەمانە دا دەژین , دەبن بە بەڵگە بۆ (ئال سعود) و زاڵمانی تر کە بۆ ماوەی 100 ساڵ ڕێگایان نەداوە موسوڵمان بژی وەك خەڵکی و ئەوانیش داهێنان بکەن لە هەموو بوارەکان دا .

هۆکاری دواکەتن و تیرۆریستی و ناشرینی ئاینی ئیسلام, تاکی موسوڵمان نەبووە . بەڵکو فەتوا سەقەتەکانی سەلەفیزم و دەسەلاتە زاڵمەکانی تر بووە .
مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) , نایەن (ملحمة الكبرى)مان بۆ هەڵگیرسێنن ، بەڵکو دێن ڕووە ڕاستی و جوانەکەی ئیسلاممان نیشان دەدەن و ڕێگامان پێدەدەن هەر یەك لە بواری خۆی دا دنیا بکات بە بەهەشت و خۆشی .

کۆتایی ئەم باسە :

بە سورەتی (الحشر) دەهێنم . باسی دەرکردنی جووەکانی مەدینە و چواردەوری دەکات :
( هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ )
سەیر بکەن نوسراوە ( اول الحشر ) , واتە : یەکەم کۆبوونەوەیان . سەیری تەفسیرەکانمان بکە , دەڵێن :
یەکەم جاریان لە (شام) کۆ بوونەوە .
سەیری مێژوی **1400** ساڵ بکە هیچ کۆبوونەوەیەکی جوو لەو ماوەیە دا بوونی نەبووە .
سەیری ئێستا بکە لە ساڵی **1948** یەکەم جار لە مێژووی جوو , لە زەمانی مووساوە لە (فلسطین) کۆکرانەوە و ئێستا خۆمان دەوڵەتی (ئیسرائیل) دەبینین .

بڕۆ بۆ ئایەتی **19** :
( وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّـهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ أُولَـٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ) .
(نسوا) لە ( نسي ) هاتووە , بە دوو مانا دێت , واتە : بیر نەکەوتنەوەی شتێك . وە بە مانای لێکەوتنی شتێك دێت .
هەردوو ماناکە بە مانای بیر چوونەوە دێت . چونکە کاتێك شتێکت بیر دەچێتەوە یان لێت دەکەوێت .
شتەکە بوونی هەیە بەڵام تۆ نازانیت چیت گووتوە یان لە کوێ دا داتناوە . یان لێتکەوتووە نازانیت لە کوێ دا لێت کەوتووە و بۆت نادۆزریتەوە .

بڕۆن بۆ تەفسیری ئەو ئایەتە , هەر لە (طبري)ـەوە هەتا ئێستا , هیچ کام لە مفسرین تەفسیریان نەکردوە .
ئێمە و ئەوانیش نازانین باسی چی دەکات ؟.. ئەو کەسانە کێن خودایان بزر کردووە و بۆچی بۆیان نادۆزریتەوە ؟..
قورئان زۆری لەو ئایەتانە تێدایە تەفسیرێکی کورتی بۆ کراوە ، من زیاتر لەسەر ئەو ئایەتانە کار دەکەم .
بە فەزڵی خودا بۆم دەرکەوتووە :
ئەو ئایەتانە هەر هەمووی باسی غەیب دەکات . بۆیە مفسرین بە ڕەحمەت بن وەك خۆی دایان ناوەتەوە و شیکاریان بۆ نەکردووە ، دایان ناوە بۆ کات و زەمانی خۆی .

( وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّـهَ ) .

ئەو کەسانەی کە خودایان بزر کردووە ئێمەین لەم سەردەمە , سەیر بکەن هەموو دەڵێین : ( لا اله الا الله)
بەڵام ڕەوت و مامۆستا و حیزبەکەمان خودامانە و (الله) لە دید و شیکاری و چاوی ئەوانەوە دەناسین .

( فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ )

ئەو کەسانە خۆشیان بزر کردووە ، چونکە هێندە تەعەصوبیان بۆ مامۆستا و ڕەوتەکانیان هەیە ئەمانیش بزر بوون .
نایەن بگەڕێن بزانن ئەسڵی دینەکە چییە و ئایا ئەوەی ئەو شوێنی کەوتووە ڕاستە ؟..
خودای زانا ڕێنمایمان دەداتێ وەك ئەو کەسانە نەبین خودایان بزر کردووە . بۆیە ئەو کەسانەی بە فاسق ناوبردووە نەك بە مشرك یان لە دین دەرچوو ( أُولَـٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ) .

دیقەت بدەن ئایەتی دوای ئەو خودای زانا چۆن هەست و ئەقڵی ئەو کەسانە دەجوڵێنێت ؟..
( لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ ) .
زۆر بە نەرمی و هێمنی بیریان دەخاتەوە ئەهلی دۆزەخ و بەهەشت وەك یەك نین . سەیری ئەو دیقەت و بەلاغەت و جوانی و نەرمی گەیاندنی پەیامی خودا بۆ عەبدە ئیماندارەکانی .
ئەو کەسانە هەموو موسوڵمانن دیندارن بەڵام بۆ خودا نەسوڵحاون . شارەزای دینن بەڵام شوێن (الله) نەکەوتوون شوێن مامۆستاکانیان کەوتوون , (الله) لە دیدی ئەوانەوە هەڵدەسەنگێنن . بۆیە بە نەرمی بیریان دەخاتەوە بەهەشت و دۆزەخ هەیە .

ئایەتی دوای ئەو ، من زۆر بیرم لێ کردووەتەوە و دژە ئیسلامیش زۆر ڕەخنەی لەسەری هەیە . لە کاتی ئەم زنجیرەیە تێیگەیشتم ، دەفەرموویت :
( لَوْ أَنزَلْنَا هَـٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّـهِ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ) .

ئەمە بیرخستنەوەیەکی تری نەرم و ئامۆژگاریەکی لۆژیکە بۆ ئەوانەی (الله) و خۆیانیان بزر کردوە .
پێیان دەفەرموویت : ئەگەر ئەم قورئانە دابەزێنن بۆ شاخێك ملکەچی فەرمانەکانی دەبێت .
تۆی موسوڵمان بۆ ناگەڕێیتەوە بۆ قورئانەکەت و (الله) و خۆت لە دیدی ئەو قورئانەوە بناسیت , نەك ڕەوت و لایەن و مامۆستاکەت ؟..

ئایەتەکانی دوای ئەو هەتا کۆتایی بە (توحید) دەست پێدەکات : ( هُوَ اللَّـهُ الَّذِي لَا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ) .
چونکە تۆی موسوڵمان خودات بزر کردووە . (الله) و قورئانەکەی داوای تەوحیدت لێدەکات .
بەڵام تۆ و مامۆستا و ڕەوتەکەت , شیر و تیر دژی یەکتر دەسوون لەگەڵ مامۆستا و ڕەوتەکانی بەرامبەرتان , کە هەردووکتان موسوڵمانن .
ئایەتەکان هەتا کۆتایی بخوێننەوە , بیرخستنەوەیە بە سیفاتە جوانەکانی خودا . هەڕەشەی تێدا نیە ، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە و بگەڕێنەوە بۆ لای (الله) .

جارێکی تر بگەڕێوە بۆ لای ئایەتەکە :

( وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّـهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُولَـٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ) .

سەیر بکەن و خۆشتان دیقەتی ئەو خەڵکە عەوامە بدەن کە شوێن مامۆستا و ڕەوتەکان کەوتوون .

99٪ یان هیچیان لەو مامۆستا و ڕەوتە دەست ناکەوێت وەك لایەنی ماددی ، بەڵکو ئەوان یارمەتی مامۆستا و ڕەوتەکان دەدەن بە هەموو شێوازەکان .

بۆیە خودای زانا دەفەرمووێت : ( نسوا الله ) , نافەرمووێت : ( نسوا الرب , یان ربهم )

ئەو کەسانە (الله) ناناسن , بۆیە بە قورئان بیریان دەهێنێتەوە : ( لَوْ أَنزَلْنَا هَـٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ ) .

مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) دێن بۆ ئەوەی ئەو (الله) و شوێن کەوتانەی نەهێڵن و خەڵکی بگەڕێننەوە بۆ لای :

( هُوَ اللَّـهُ الَّذِي لَا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَـٰنُ الرَّحِيمُ ) .

( هُوَ اللَّـهُ الَّذِي لَا إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَانَ اللَّـهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ) .

( هُوَ اللَّـهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ) .

لە کۆتایی دا : دەپرسم : کوا خوا ؟..

تۆش بڕۆ خوداکەت بدۆزەوە پێش ئەوەی ببیت بە سوتەمەنی ساحەی ئەم یاریەی داهاتووی شەڕی نێوان خوداکان

چونکە خودای خالق دینەکەی سەردەخات و خوداکانیش لەناو دەبات بە مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) .

خۆت مەدە بە کوشت بۆ هیچ خودایەك .

ئەمڕۆ 2019/6/21 , لە (کفری) , لە ناوچەی (جبل حمرین) , شوێنکەتەی خودای (سۆفی و سەلفی) ,

کردیان بە شەڕە بۆکس و نوێژی جومعە ئەنجام نەدرا . چاوەڕوانی شەڕی زیاتری نێوان خوداکان بن ،

بۆ ئەوەی ساحەی یاریەکە خوێناوی تر بێت ...

الا هل بلغت ؟..

الا هل بلغت ؟..

الا هل بلغت ؟..

تێبینی : باسی (یماني) و (هەرمجدۆن) و زۆر شتی تریش کراوە . تکایە خۆتان بگەڕێن و فێری دین و دنیا بن ,

کەس پرسیار نەکات ئەوە چیە ؟..

ئەگەر وەك ڕەجەب بیت هەنجیرەکە بکەوێتە دەمت ..

دڵنیا بە لە شەڕی ئەم خودایانەدا تۆش دەبیت بە خۆراکی ئەم شەڕانە ..

## کۆتایی :

لە کۆتایی دا دەڵێم :

ئەگەر تۆ شارەزای مێژووەکەت نەبیت شوێن هەموو خوداکان دەکەویت . هەموان دەڵێین (لا اله الا الله) ، بەڵام (الله) بزرە لە لامان , نەك (رب) , بۆیە مەنهەجی دینەکەمان لە مامۆستا و ڕەوت و لایەنەکەمان وەردەگرین . (ئلوهیەت) و (ربوبیەت)مان لا تێکەڵاو بووە . بابەتی ئاخر زەمان و مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) لەگەڵ (دەجال) پێوەرە بۆ ئێمەی تاك ئاینەکەمان بناسین و بگەڕێینەوە بۆ لای (الله)ـی قورئان . نەك ئەو (الله)یەی لە ڕێگای مامۆستا و ڕەوتەکانمان ناسیومانە چونکە (الله) مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) نانێرێت شەڕ بۆ ئێمە بکات . ئێمە دینەکەمان کردووە بە هەزاران پارچە و بەش و فرقەی جیا جیاوە , نەك (دەجال) یان نا موسوڵمانەکان . بۆیە مەهدی و مەسیح (علیهما السلام) دێن ، ئاینەکەی (الله) بگێڕنەوە بۆ ئەسڵەکەی , وە (دەجال)یش دێت ئەم هەموو فیرقە و ڕەوتانە نەهێڵێت کە بە ناوی (الله)وە دینداری دەکەن ..
( مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ )

خودای زانا لە ڕێگای مەسیح و مەهدیەوە (علیهما السلام) , جارێکی تر بۆ کۆتا جار لە ئاخر و تەواو بوونی زەمان دا ئاینەکەی بە ڕاست و دروستی دەگەیەنێت بە هەموو جیهان . چونکە ئێستا ئاینی خودا شێوێندراوە و نازانرێت لە کێ وەربگیرێت . بەلام دوای مردنی مەسیح و مەهدی (علیهما السلام) . ئاین ڕوون و ئاشکرایە کە گەڕاوەتەوە بۆ ئەو ئەسڵەی خودا دەیەوێت . ئەو کات (یاجوج و ماجوج)مان بۆ دێت و عەلامەتەکانی تر دەردەکەون , بۆ کۆتا جار .. ئاخر زەمان هەڵدەگیرسێت ..

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين